**خاوەنی ئیمتیاز**
وەزیری رۆشنبیری

**سەرنووسەر**
محەمەد باوەکر

**سکرتێری نووسین**
کەریم سۆفی

**بەڕێوەبەری نووسین**
بورهان ئیبراهیم یەعقوب

ناوی کتێب: لەپێناوی پاراستنی ژینگەی کوردستاندا
زنجیرەی: (٣٠)
نووسینی: تاهیر عوسمان
نەخشە سازی و هونەرکاری : هاوکار کۆیی
پیتچنین: بوشرا حەیدەرباوە
بەرگ : چاپخانەی منارە
فەرزی بەرگ: نووسینگەی گۆڤار
سەرپەرشتی چاپ: سەعد شکاک
تیراژ: ٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارە (٩١)سالی ٢٠٠٧ دراوەتێ
چاپخانە: رۆشنبیری هەولێر ٢٠٠٧

# لەپێناو پاراستنی ژینگەی کوردستاندا

## پێشەکی :

مەسەلەی ژینگە ئەمڕۆ بە یەکێك لە پرسە گرینگ و پڕبایەخەکانی جیهان دادەنرێ و ئەو چەمکە چووەتە ناو فەرهەنگی سیاسی و بەرنامەی کاری حیزبەکانەوە.

پاراستنی ژینگەو داکۆکی لێکردن و هەوڵدان بۆ ئازار نەدان و زیان پێ نەگەیاندنی و پیس نەکردنی، وەکو بڕگەیەکی سەرەکی کارنامەو پەیڕەوی زۆربەی پارتە سیاسییە هاوچەرخەکان پێش کەش دەکرێ و کارتێکی جەخت و گوشار دروست کردنیشە بۆ ئەوەی هەرەس بە پارتە ڕکابەرەکانی تر بێنن و لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا بەرزترین ڕێژەی دەنگەکان مسۆگەر بکەن.

لەپاڵ ئەوەی کە چەندین پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوی ژینگە پارێز لێرەو لەوێ سەریان هەڵداوەو ئەرکی پاراستنی ژینگەو ڕێگە گرتن لە هۆکارەکانی پیس بوونیان گرتۆتە ئەستۆو ئەو ڕێکخراوانە ئەمڕۆ بە باڵێکی سەرەکی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەقەڵەم دەدرێن، چونکە پاراستنی ژینگەو داکۆکی لێکردن و بەفیڕۆنەدانی سامانە سروشتیەکان و پیس نەکردنی ئاوو هەوا و خاك هەنگاوێکی سەرەتایی بە مەدەنی بوون و پەیژەی پێش کەوتن و شارستانیەتە .

ئەگەر چی دروست بوون و کارکردنی ئەو چەشنە ڕێکخراوانە هێشتا

له ولاتی ئێمەدا وەکو پێویست نییە و ژینگەی کوردستانیش وەکو ژینگەی هەرێمەکانی تری ناوچەکەو ولاتانی دەوروبەر کارێکی زۆری دەوێ و پێویست دەکات هەوڵ و تەقەللایەکی زیاتری بۆ بخرێتە گەڕ، بەلام ئومێد زۆرە ڕۆڵی ئەو ڕێکخراوانەو هەوڵدانیان بۆهوشیارکردنەوەی خەلك کاراتر بێ و دامودەزگاحکومیەکانیش پتر بێنە پێشەوە وهەنگاوەکانیان زانستیانە تروپشتربێ و بەرچاو روونتربین و دەرك بەمەترسیەکانی پیس بوونی ژینگەو زیانە چاوەڕوان کراوەکانی بکەن .ئەم چەند وتارەی تویێی ئەو نامیلکەیەش کەبەشێکیان پێشتر لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان بلاوکراونەتەوە .هەولێکی سەرەتاییە لەپێناو ناساندنی ئەوبوارە گرینگەو خوێندنە وەیەکە بۆبەشتێك لەو فاکتەرانەی دەبنە هۆی پیس بوونی ولاتە جوانەکەمان و ناشیرین کردنی و دواتر بلاوبونەوەی دەردو بەلاو نەخۆشی و بێزار کردنی دانیشتوان.

بەو هیوایەی سوودێك ببەخشێ و هەولی زیاتری بە دوادابێ.

هەولێر

٢٠٠٦/٩/٢٤

## هەنگاوە سەرەتاییەکانی پاراستنی ژینگە

کێشەی ژینگە ئەمڕۆ لەوە تێپەڕیوە کە هەر تەنها بە چەند بڕیارو هەنگاوێکی خاوو لەسەر خۆی حکومەت چارەسەربکرێ، هەرچەندە هەڵمەتە گەورەو چارەسەریە بنبڕەکانیش لەلای ئەوان بێ، بەلآم کە حکومەت لێی بێ ئاگابوو، ئەمەوا ناگەیەنێ.

- خەڵك- جەماوەریش لێی بێخەم بن و هیچ نەکەن. بەڵێ ئەرکە گەورەکە لەسەر شانی دەسەلآتەو پڕۆژە گەورەکان و کارە گشتییەکان لە وڵاتە دواکەوتوو تازە لە خەم ڕەخسیوەکانی وەکو وڵاتی ئێمە تەنها لە دەست ئەو دایە، بەتایبەت کاتێك هیچ ڕێکخراوێك و دامەزراوێکی کۆمەڵگای مەدەنی نەبێ بەشێك لەم ئەرکە لە ئەستۆ بگرێ و گوشاری زیاتر لەسەر لایەنە پەیوەندیدارەکان دروست بکات، بەلآم ئێمەی هاوولاتی و یەك بەیەکی تاکی کۆمەڵ با لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین، کە بەشێکی هەرە زۆرمان لەم بوارەدا کەمتەرخەم و سستین، بەداخەوە هێشتا هۆشیاری ژینگە پارێزی و خۆشەویستی ئاوو هەواو ئازار نەدان و جوان ڕاگرتنی شوێنی ژیان و کارکردن و حەوانەوەمان تێکەڵ چەند لێکدانەوەو بوچوونێکی هەڵەی کۆن بووەو بەلایەنی دەسەلآتدارو هاوسۆزیمان بۆ ئەم و ئەو بەستراوەتەوە ئەفسووس لەوە بێ ئاگاین کە پاراستنی ژینگە، واتە جوان کردن و تام و چێژ وەرگرتنێکی زۆرتر لە ژیان، بۆیە پێویستە ئەم پەیوەندییە پچڕاوەی نێوان مرۆڤ و دەوروبەرەکەی لێك ببەستینەوە، دەکرێ ئەم ئاشت بوونەوەیەش بە چەند هەنگاوێکی بچووك و کارێکی سادەی ڕۆژانەمان دەست پێ

بکات. با چاوەڕوانی کەس نەبین، بەتەمای سۆزو لالێ کردنەوەی هیچ ڕێکخراوو لایەنێك نەبین با ئەوەندەی پێمان دەکرێ و لە تواناماندا هەیە ئەو کارانە بکەین کە زۆر ساکارن بەڵام گرینگ و بنەڕەتین ئەوانەی تریش بە فەرمی و بەدەنگ هەڵبرین و داواکردنێکی شارستانیانەی هاوچەرخ بخەینە ئەستۆی ئەوانی ترەوە، دەکرێ هەنگاوی یەکەممان لە پاککردنەوەی ناو ماڵ و بەردەرگا و چۆنیەتی فڕێدانی زبڵ و پیسایی‌یەکانەوە دەست پێبکات، لە ڕادانی ئاوی جۆگە و بەرشۆستەکانەوە بێ ، لە پاك ڕاگرتنی پۆلەکانی وانە وتنەوەو ژێر کورسی و سەرمێزی فەرمانگەکانمانەوە، لەپەنا ئەو ئامێرەی کاری لەسەردەکەین، لەو شەقامەی ئۆتۆمبیلەکانمانی لەسەر لێ دەخوڕین و ڕادەگرین. لەبەرئەو دوکان و کۆگاو بازاڕانەی کاسبی لێدەکەین، با زەوق و ئارەزوویەکی تێکەڵ بە هەست و خۆشەویستی شارو جێگاکەمان هەبێ، بەبێ منەت کردن بەسەرکەس و چاوەڕوانی کردن هەرکەسەو لەلای خۆیەوە دەست پێ بکات. کە ئەوەشمان کرد ئێمە لەلای خۆمانەوە زەنگی پاککردنەوەی بەردەرگای ماڵ و فەرمانگەو قوتابخانەو دوکان و بازاڕەکانمان لێدا، ئەو کاتە تۆپەکە دەکەوێتە گۆڕەپانی دەسەڵاتداران و ئەوانیش کە ئەو حەماسەت و گوڕو تینەی ئێمە دەبینن دەستێك لە خۆیان دەدەن و دەجووڵێنەوە.... کەواتە مەردی خوابن با دەست پێ بکەین ....

# هۆشیاری ژینگەیی

یەکێك لەو ئامانجە سەرەکیانەی پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوە ژینگە پارێزەکان کاری بۆ دەکەن و هەوڵی بۆ دەدەن و کردوویانەتە بەشێکی سەرەکی بەرنامەکانیان، بەرز کردنەوەی ئاستی هۆشیاری ژینگەیی خەڵکە، چونکە ئەوان پێیان وایە بایەخدان بەو خاڵە و ڕاهێنانی خەڵك لەسەر ڕێزگرتنی ژینگەو پاراستنی، واتە ئازار نەدان و زیان نەگەیاندن بە ژینگە بە گشتی و بە پاك و خاوێن ڕاگرتنی، هەروەها جەخت کردنە سەر حکومەت و کۆمپانیاو فەرمانگەکانیش بۆ پیادەکردنی هەمان ئەوڕێ و شوێن و ئامانجانە، کەواتە هۆشیاری ژینگەیی بەبەردی بناغەی ژینگە پارێزی و زیان پێ نەگەیاندنی دادەنرێ، هەر وڵات و گەل و نەتەوەکیش ئەم خاڵەی تیا چەسپاو ڕۆڵەکانی بە گرینگیان زانی، ئەوە نەوەك هەر ڕێزلەو بنەما/ شارستانیە/ دەنێن و ژینگەکە دەپارێزن، بەڵکو دەبنە بەربەست و ڕێگە نادەن حکومەتە بە دەسەڵات و کۆمپانیا جیاجیا بە تواناکانیش زێدەڕۆیی بکەنە سەر ژینگە، لەبەرئەوەی ئەگەر هەر تاکێکی کۆمەڵ ژینگەی شارو لادێ و گەڕەکەکەی خۆی بە یەکێك لە مەسەلە جەوهەریەکان زانی و پاراستن و ئازار نەدانی بەئەرك و لێپرسراویەتی و بەشێك لە بەهاووڵاتی بوونی خۆی لەقەڵەم دا. ئەوە ئامادەیە زۆر بەتوندی داکۆکی لێبکاو لە کاتی پێویستدا بێتە سەر شەقام و بەخۆپیشاندان و ڕێپێوان سازکردن یەخەی دەسەڵات بگرێ و قوربانیشی لەسەربدا. کەواتە زۆر گرینگە وا لە مەسەلەکە بگەین

که پاراستنی ژینگەو بەپاك و خاوێن ڕاگرتنی جابەهەر جۆرێك بێت، لەسەرئەوبنە مایەی کەوا ئەو پاراستنە، ژیان بەگشتی لەئەمامەتی و مەترسی دەپارێزێ و جوانی و تامو چێژێکی پتری پێدەدا، مافێکی گشتییە و هەموو تیایدا بەشدارن و بەشێکە لە مافی بەهاوولاتی بوون و ڕەنگدانەوەی ئەو هەست کردنەش لە ڕەفتارو کرداری ڕۆژانەماندا، ئەوە مافەکە تۆ کەمترو بەهێزتر دەکا. ئەم مەسەلەیەی سەرەوە لە ولاتە پێشکەوتووەکان بەهەند هەلدەگیرێ و بەجیدی کاری بۆ دەکرێ و ژینگە پارێزی چووەتە قاوغێکی ترو سیمایەکی شارستانی بەو کۆمەلگایانە داوە و زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بلێین بووەتە یەکێك لە پایەکانی سەرکەوتن بەرەو بەمەدەنی بوونی کۆمەلگا بەگشتی، چونکە ئەگەر دامەزراندن و تەشەنە کردنی کۆمەلەو سەندیکا مەدەنییەکان و کارو چالاکییەکانیان بالێکی ئەو بەمەدەنی بوونە بێت، ئەوە بەشێکی زۆری ئەو ڕێکخراوانە بەتایبەت بە مەبەستی پاراستنی ژینگەو زیان پێنە گەیاندنی دامەزراون. کەواتە ئێمەی کوردستانی کاتێك خۆمان وا دەردەخەین کە هەنگاو بەرەو بەمەدەنی بوونی کۆمەلگا دەنێین و لەزۆر ڕووەوە لە کۆمەلگاکانی دەوروبەر جیاین و پێشکەوتوترین، دەبێ ئەو خالەمان لەبەرچاوبێ ئەگەر ژینگە پارێزی تا ئێستا هەر بە سادەیی و بەپەلەو وەکو مۆدەخرابێتە بەرنامە و پەیڕەوی پارت و کۆمەلەو سەندیکاکان، دەبێ لەمەودوا ئەو بەرنامانە بخەینە بواری پراکتیزە کردنەوەو هەولێ بدەین سەرەتا ئەو هۆشیارییە (مردووە) لەلای تاکی کۆمەلگای کوردەواری زیندووبکەینەوەو گەشەی پێ بدەین، ئەگەر ئەو مەسەلەیەش لەبەر زۆر هۆی لابەلاو لاوەکی لەلای تاکی ئێمە

فەرامۆش کرابێ و کەسێك و لایەنێك نەبووبێ ڕێ نموویی بکاو ئەو بابەتە گرینگەی بۆ ڕوون بکاتەوە، کارەکە قورستر دەکاو مەودا زەمەنییەکەی درێژتر دەکاتەوە، بۆیە بوژاندنەوەی ئەم هۆشارییە لەم قۆناغەی ئێستاماندا کە لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان پێیەتی، هەر بە تەرخانکردنی چەند لاپەڕەیەکی ئەم ڕۆژنامەو ئەو گۆڤارەو چەند وتارێکی بەپەلە مەیسەر نابێ، بە کردنەوەی چەند ڕێکخراوێك تەواو نابێ کە کەس بەچالاکیەکانیان نازانێ، بەڵکو پێویستی بە کۆڕو سیمیناری جەماوەری فراوان هەیە. پێویستی بەبەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی زۆرو بەردەوام هەیە. چاوەڕوانی ڕۆڵی مامۆستایانی ئاینیە تاوەکو ئەوانیش جەماوەری لێ هۆشیاربکەنەوە، لەمانەش گرینگتر پێویستە بخرێتە بەرنامەکانی خوێندن و نەوەی داهاتوومان لەسەر ئەو بنەما گشتیانە ڕابێنین و ژینگەیان لەلا پیرۆزو خۆشەویست بکەین، چونکە ئەگەر زیندووکردنەوەی ئەم هۆشیارییەو برەو پێدانی لەلای نەوەی ئێستا ئاسان نەبێ و تاکی ئێمە دەقی بە ژیانێکی بێ بەرنامەییەوە گرتبێ و دەست بەرداری نەبێ، دەرگای بیرکردنەوەو نوێ کردنەوەی هزری خۆی قوفڵ دابێ، خۆ دەبێ نەوەی ئایندە لەسەر گرینگی ئەم مەسەلەیە پەروەردە بکەین و کارێك بکەین ئەو زیانانەی ئەمڕۆ بە ژینگەی دەگەیەنین ، لە داهاتوودا بنبڕبکرێن و پێچەوانە ببنەوەو ژینگە جوانەکەی کوردستان و ئاوو هەواو خاك و خۆڵی و سەرچاوە ئاویەکانی ئەو بەهەشتەی سەر ڕووی زەمین بپارێزین .

# کاریگەری دەنگە دەنگ لەسەر ژینگەی شارەکان

کاتێك دەنگە دەنگ، دانیشتوانی شارە گەورەکان هەراسان دەکاو دەیانخاتە حاڵەتی نیگەرانیەکی بەردەوام و تێکچوونی دیمەنە جوانەکانی سروشت، بەڵکو ئەو دەنگانە لەو سەردەمەی ئێمەدا ژیانی دانیشتوانی ئەو شارانەی ناخۆش کردووەو بووەتە هۆی بەرپابوونی چەندین نەخۆشیش، دەکرێ پیس بوونی هۆی ژاوە ژاو – Noise pollution – بەوە پێناسە بکەین کەوا حاڵەتی تێکەڵ بوونی کۆمەڵە دەنگێکی بێزار کەرە کە کار لە تەندروستی مرۆڤ دەکاو ئەو دەنگانەش بوونەتە سەر چاوەی نیگەرانی و تێکچوونی ئاسوودەیی مرۆڤ، هەروەها کار لە هەردوو ئامێری گوێ گرتن و دەمارەکانی مرۆڤ دەکات، بەتایبەتی ئەگەر لە سنووری خۆیدا تێپەری.

ئێستاش لە شارەکاندا دوو سەرچاوەی سەرەکی ژاوە ژاو و دەنگە دەنگ هەیە کە ئامرازەکانی گواستنەوەو دامو دەزگا پیشەسازیەکانن، ژاوە ژاوی پیشەسازی لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا ڕوودەدات، بەڵام ژاوە ژاوی هاتوچۆو ڕێگاوبان لە هەموو شوێنێکدا هەیە کە تیایدا دەژین، بەشێوەیەك کە ناتوانین تێبینی بکەین، بەڵکو هەڕەشە لە ژیان و تەندروستیمان دەکات، ڕێگاو هێڵە ئاسنینەکان و فڕۆکەخانەکانیش بەسەرچاوە سەرەکیەکانی ژاوە ژاوی هۆکارەکانی گواستنەوە دادەنرێن، ئەو ژاوە ژاوەی کە لە فڕۆکەخانەو شەفەندەفەرەکاندا دەردەچێت وەکو ژاوەژاوی

پیشەسازی لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا هەن، بەلاّم ژاوە ژاوی دەرچووی ئۆتۆمبیلەکان دەکریّ لە هەموو شویّنیّك و دەورووبەری هەموو گەڕەك و مالّیّکدا ببیسترێ، ئاستە بەرزەکانی ژاوە ژاو مەترسیەکی زۆریان لەسەر کۆ دەمارەکان هەیەو زیان بە تەندروستی جەستەیی و دەروونی مرۆڤ دەگەیەنن.

ئەو کەسانەی دووچاری ژاوە ژاو و دەنگە دەنگیّکی زۆر دەبنەوە، چەندین نیشانەی خەمۆکی و سەریەشەو بیرپەرت بوونیان لیّ دەردەکەویّ، هەروەها ژاوەژاوی بەرز مرۆڤ تووشی سەر سووڕان و هەست بە ترس کردن دەکات. لەژێر ئەو کاریگەریانەش چەند گۆڕانکاریەك لە لەشی ئادەمیزاددا ڕوودەدات وەکو تیّکچوونی شیّوەی کارکردنی کۆدەمارەکان کە دوورنییە مرۆڤەکە تووشی کەربوون بکات. ئەو کاریگەریە بەردەوامەی سەرکۆ دەمارەکان دەبیّتە هۆی خەو بزرکان و دەمارگیری و هەراسانیّکی بەردەوام. بەتایبەتی ئەگەر ڕێژەی ژاوە ژاوەکە خۆی لە (٩٠) دیسیل بدات. ئامارەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کەوا (٧٠٪) ی نەخۆشیەکانی کۆدەمارەکان کە خەلّك لە جیهاندا دووچاری دەبیّ، لە ئەنجامی ژاوە ژاویّك بووە بە ڕێژەی (٨٠– ١٠٠) دیسیل.

ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەرانسەری جیهانیش لە تەمەنی نیّوان (٥٠–٦٠) سالّی بەهۆی ژاوە ژاو هەستی بیستن بە تەواوەتی لە دەست دەدەن خۆیان لە دەیان ملیۆن کەس دەدەن. هەروەها ژاوە ژاو ڕۆلّیّکی گەورەی لە دووچاربوونی ئەو نەخۆشیانەوە هەیە، کە لە ئاکامی گرژیەوە سەر هەلّدەدەن وەکو نەخۆشیەکانی گەدەو پالّەپەستۆی خویّن. لە هەمان کاتدا شارەزایان دەلّیّن ئاستە

بەرزەکانی ژاوە ژاو چەند نەخۆشیەکی ژینگەیی لێ دەکەوێتەوە وەکو گوێ گرانی و شەکرە و ڕەق بوونی دەمارەکان ئەو گۆڕانکاریە فسیۆلۆژیانەو چەندانی تریش لە نەخۆشیە ئۆرگانیەکان کە کاریگەریەکی خراپیان لەسەر بیستنی ئادەمیزاد هەیە. ئەگەر ئاستی ژاوە ژاو - یش بگاتە (١٢٠) دیسپل ئەوە میکانیکیەتی بیستن بە تەواوی دەشێوێ لەگەڵ چەند ئازارێکی توند لە کۆئەندامی دەمارەکان و سووڕی خوێن و زیادبوونی لێدانی دڵ. لە لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکیدا هاتووە ئەگەر ڕێژەی ژاوە ژاو گەیشتە (٨٠) دیسپل یاخود زیاتر، ئەوە دەبێتە هۆی هیلاکی و ماندوو بوونی ئادەمیزاد بەتایبەتی بۆ خانمان، چونکە ئەو دەنگە گەورەو ناخۆشانە ڕەنگی پێست و جوانی ڕوخسار دەشێوێنن و ماك و پەڵەی ناشیرینی لێ دیاردەدا. وا دەرکەوتووە کەوا کۆرپەلەی ناو سکی ئافرەت بە بیستنی دەنگە مۆسیقیە هێمنەکان ئارام دەبێ و لێدانی دڵی زۆر ئاساییە، بەڵام لە حاڵەتی بیستنی دەنگە گەورەکاندا ئەندامەکانی بەشێوەیەکی نائاسایی دەجوولێن و لێدانی دڵی زیاد دەکا، لەلایەکی ترەوە بە پێی لێکۆڵینەوە زانستیەکان ئاستە بەرزەکانی ژاوە ژاو کارێکی خراپ لە حاڵەتی دەروونی و جەستەیی دەکات لەوانەش چالاکی ئەو کەسانە بە تەواوی کەم دەکاتەوە کە لە بواری نووسین و پیشە دەستیەکانی تردا کاردەکەن. لەبەرئەو کاریگەریە زۆرانەی سەرەوەش، ئاساییە کەوا وڵاتە پێشکەوتووەکان چەندین ڕێ و شوێنی گونجاو بۆ ڕێگە گرتن لە ژاوە ژاو لە ڕێگا گشتیەکاندا بگرنە بەر، لەگەڵ زیاد بوونی هوشیاری هاووڵاتی و لێپرسراوانیش بەم مەترسیە گەورانە لەگەڵێك وڵاتدا ناوچە

نیشتەجێیەکان لەو دەنگ و ژاوە ژاوە بێزار کەرانە دەپارێزن بۆ نموونە لە وڵاتی فینلەندا بەپێی یاسای پاراستنی ژاوە ژاو، حکومەت ئاستی ڕێگە پێدراوی ژاوە ژاوی بە ڕوونی دەست نیشان کردووە، بەجۆرێك کە ڕێژەی ژاوە ژاو بە ڕۆژ لە (٥٥) دیسپل و بەشەو لە (٤٥) دیسپل تێپەڕنەکات، ئەم مەرجانەش لە کردنەوەو دروست کردنی ڕێگاکاندا بە هەموو جۆرەکانیەوە جێبەجێ دەکرێن و دەبێ بەر لە کردنەوەی هەر پرۆژەیەکی لەم جۆرە کاریگەریە ژینگەییەکانی هاتوچۆی لەسەرە، لەبەرچاو بگیرێ بەشێوەیەك کە هیچ ئەزیەت و ناخۆشیەك بۆ دانیشتوان دروست نەکات، لەبەرامبەریشدا ڕێگە نادرێ هیچ گەڕەك و یەکەیەکی نیشتەجێ بوونی تازە بکرێتەوە، تەنها دوای دڵنیابوون نەبێ لەسەلامەتی و دووری لە ژاوە ژاو و کاریگەریە خراپەکانی ، لە وڵاتی خۆشماندا لە کاتی دروست کردنی گەڕەکی تازەو ڕێگاوبان و هێڵە خێراکانی هاتوچۆدا نەوەك هەر خۆپارێزی لە ژاوە ژاو لەبەرچاو ناگیرێ و گوێ بەم خاڵە گرینگە نادرێ، بەڵکو بێ بەرنامەییەکی زەقی پێوە دیارەو لە زۆر لە پێداویستیە بنەڕەتیەکانی تریش بێبەشە. بە داخەوە پلان دانانی تەلارسازی لە وڵاتی ئێمەدا ئەوەندە کزە هیچ کام لە فاکتەرەکانی پاراستنی تەندروستی و ئارامی مرۆڤی تیا لەبەرچاو ناگیرێ، بەڵکو زۆرجار وا ڕێك کەوتووە هێڵە خێراو سەرەکیەکانی هاتوچۆ بەناو جەرگەی شارەگەورەکاندا دەڕواو بەشەوو بەڕۆژ ئۆتۆمبیلێکی زۆری بارهەڵگر هاتو چۆی پیادا دەکات و ئارامی دانیشتوانی گەڕەکەکانی شێواندووە.

بەژاوە ژاو و دەنگە بێزارکەرو هۆڕن و خێرایی لێخوڕینیان، ژیانیان

تاڵ کردووه. بۆیه ئاساییه ئهگهر چهندین جۆره نهخۆشی ههروهك ئهوانهی لهسهرهوه ئامارهیان پێ کرا له ئاکامی ژاوه ژاو لهناو کۆمهڵگای ئێمهدا سهر ههڵبدات، چونکه هیچ دهزگایهکی پهیوهندیدار نییه ڕێژهی ژاوه ژاو بهشێوازه زانستیهکهی تۆماربکاو به خهڵکی ڕابگهیهنێ و هاووڵاتیانی لێ بپارێزێ، بۆیه ڕۆشنبیری گشتی جهماوهر لهم بارهوه لاوازهو خهڵك به گشتی گوێ بهم بواره گرینگه ناداو بگره هیچی له بارهوه نازانێ، بهو هیوایهی له ئاینده‌یه‌کی نزیکدا چهندین ڕێکخراوو سهندیکای ژینگه پارێزی بههاوکاری دامو دهزگا حکومیهکان، هاووڵاتیان لهو مهترسیه گهوره چاوهڕوان کراوانه ئاگادار بکهنهوهو ههوڵ بدهن له داهاتوودا ئهو مهرجه تهندروستییه گرینگانه لهبهرچاو بگرن له پێناو پاراستنی تهندروستی هاووڵاتیان و دهرخستنی ڕووی جوان و شارستانی شارهکانی کوردستان و ژینگهیهکی پاك و خاوێندا.

# دووباره بەکارهێنانەوەی پاشماوەکان وەك فاکتەرێك بۆ خاوێن کردنەوەی ژینگە

ئێمە ڕۆژانە کەرەستەو کەلوپەلێکی بێ کەڵك و لەکارکەوتووی جۆراو جۆری زۆر تێکەڵ دەکەین و فڕێیان دەدەین. بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا ئەو ماددە تووڕ هەڵدراوانە تا چەند زیان بە ژینگەو دەوروبەرەکەمان دەگەیەنن و دەبنە هۆی ناشیرین کردنی سیمای شارەکان و بێزلێ کردنەوەیان و چ زیانێکی گەورەش بە ئابووری وڵاتەکەمان دەگەیەنن، چونکە ئەگەر بە وردی لە تێچوو خەرجی دروست کردن و بەرهەمهێنانی پەڕە کاغەزێك و قووتویەکی شیری منداڵان و شووشەیەکی ساردی و پەرداخێکی پلاستیك ورد ببینەوەو بزانین بەچ شێوەیەك هاتوونەتە بەرهەم و کەوتوونەتە بەردەستمان، ئەوە هەرگیز بەم کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانە بەیەکەوە لوولیان نادەین و هەوڵ دەدەین بۆ زۆر ترین ماوە سوودیان لێ وەربگرین و دوای لەکارکەوتن و بێ سوود بوونیشیان بەجیاکۆیان بکەینەوەو بۆ شوێنی مەبەست و دووبارە دروست کردنەوەیان ڕەوانە بکەین. کەواتە ئەو تێکەڵی و ئاڵۆزیەی ئێمە ڕۆژانە لە کۆکردنەوەی زبڵ و پاشماوەکان پیادەی دەکەین، نەك هەر شێوەیەکی شارستانی نییە، بەڵکو زیان بە ژینگەو ئابووری وڵات و تەندروستی هاووڵاتیان و سیمای جوانی شارەکان دەگەیەنێ، بۆیە دووبارە بەکارهێنانەوەی ماددەیەك (Reuse) کە بەمەنگاوی نێوان بەکارهێنان (use) و دووبارە دروست کردنەوەی ماددەسەرەکیەکە (Recy cling)

دادەنرێ، هەنگاوێکی کاراو ئابووری ترە، چونکە لەلایەک تێچووی کەمترە، لەلایەکی دیکە قەبارەی پاشماوەو زبڵەکان کەم دەکاتەوەو ئەو نارێکیەی کۆکردنەوەی زبڵەکانیش بەو ناشیرینە بەرچاو ناکەوێ کە ئێستا هەیەو دەکرێ دەست بە بەکارهێنانی زیاد لە پێویستی هەندێك ماددەوە بگرین کە ئێمە ڕۆژانە زیادەڕۆیی لەبەرکاهێنان و بەفیڕۆدانیان دەکەین و هەستیش بەو زیانە زۆرە ناکەین کە لەو زیادە ڕۆییە دەکەوێتەوە. بۆ نموونە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا زیاد لە پێویست کاغەز بەکاردەهێنین چ وەکو ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب کەبەشێکی زۆری ئەو بڵاوکراوانەش زیاد لەپێویست چاپ و دابەش دەکرێن، هەروەها کاغەزێکی زۆر لەنامە ناردن و نووسراوی ناو فەرمانگەو قوتابخانەو زانکۆکان بەکاردەهێنین کە زۆر پێویستە لەپێناو پاراستنی ژینگەی ولاتەکەمان دەستی پێوەبگرین وتا بکرێ بۆ نامەناردن شێوازی پێشکەوتووی وەکو (E-mail) بەکاربێنین، یا لە کۆپی کردنی نووسراوو نامەکاندا لەسەر هەردوو ڕووی کاغەزەکە بنووسین و کۆپی بکەین و بەدەفتەرو کتێبە کۆنەکانیشماندا بچینەوەو دووبارەبەکاریان بێنینەوە یاخود لە جیاتی کرین و بەکارهێنانی دەفتەری تازە پەڕە کۆنەکان بەیەکەوە چەسپ بکەینەوەو دەفتەری بچووکی گیرفانی لێ دروست بکەین کە بۆ زۆر شت بەکەڵك دێن و تابکرێ لەماڵ و فەرمانگەکاندا کارتۆن و مقەباکان فرێ نەدەین و دووبارە بەکاریان بێنینەوە هەوڵ بدەین ڕۆژنامە کۆنەکان و کاغەزەکانی کۆمپیوتەر بۆ داپۆشینی کەلوپەل و خۆراك بەکاربێنین بۆ دووبارە سوود وەرگرتنەوەو چارەسەرکردنی ئەو کاغەزە زیادانەی کە ئێمە ڕۆژانە فرێیان دەدەین دوو جۆرە

کاغەزمان هەیە.

یەکــەمیان کاغــەزی دوای بــەکارهێنان (post consumer) و کاغەزی بەر لە بەکارهێنان (per Consumer) حاڵەتی یەکەمیش ئــەو کاغەزانــە دەگرێتــەوە کــە بــۆ دووبــارە دروســت کردنــەوە کۆدەکرێنەوە، بەڵام حاڵەتی دووەم ئەو پارچە کاغەزە وردانەیــە کــە لــە کــاتی دروســت کردنــی پارچــە کاغــەزی گــەورەو پاشمــاوەی چاپخانەکاندا دەمێننــەوەو دووبــارە دەبردرێنــەوە نــاو کارگــەکانی کاغــەزو دەتوانــدرێ شــەش جــار ســوود لــە دەزوولــەکانی کاغــەز وەربگیرێ بەرلــەوەی زۆر لێــی بیهێزببــێ و کــەڵکی نــەمێنێ، کەواتــە دەکــرێ پاشماوەکــان وەکــو کەرەســتەیەکی خــاوی پیــشەسازی بەکاربێنینەوەو ئەو دووبارە بەکارهێنانەوەیــەش بڕێکــی زۆری وزەو سەرچاوەکان پاشکەوت دەکات .

بۆ نموونە دووبارە بەکارهێنانەوەی تەنێك کاغەزو کارتۆنی کۆکراوە (١٧) داری گەورە و (٢٢٧١٢٥) لیتر ئاوو (٤٢٠٠) کیلۆوات کارەبا و (٤) بەرمیل سووتەمەنی و (٤٠٢) موترسێجا لە پاشماوەکان و (٢٨) کیلۆگرام لە هەوای پیس دەگەڕێنێتەوە.

هەروەها دروست کردنی کاغەز لە ماددە دووبارە بەکارهێنراوەکان پیس بوونی ژینگە بــە ڕێــژەی ٧٤٪ و پــیس بــوونی ئــاو بــە ڕێــژەی ٣٥٪ کــەم دەکاتــەوە. لــە هــەمان کاتــدا هــەروەك بــەراوردێك لەگــەڵ ژمارەکانی سەرەوە دروست کردنی تەنێك لە کاغەزی تازە.

پێویــستی بــە ١٦٧٢ کیلــۆگرام دارو ٩١٠٠٠ لــیتر ئــاوو ٩٨ کیلــۆگرام کلس و ١٦٣ کیلۆگرام قالب خوێ و ٢٤ کیلــۆگرام خوڵەمێــشی ســۆدا هەیە، لە پاڵ پێویستی چارەسەرکردن و فڕێدانی ٣٨ کیلــۆگرام لــە

هەوای پیس و (٢٠) کیلۆگرام ئاوی پیس و بۆگەن و (٨٠) کیلۆگرام لە پاشماوە ڕەقەکانی دار کە بەکەڵکی هیچ نایەن و پێویستە ژینگەیان لێ بپارێزین. وە نەبێ دووبارە بەکارهێنانەوەی کەلوپەلە لە کارکەوتوەکان و دووبارە دروست کردنەوەیان هەرتەنها تایبەت بێ بە کاغەزو کاتۆنەوە.

بەڵکو هەمان ڕێو شوێن بەسەر ئەلەمنیۆم و شووشەو نایلۆن و پلاستیکیشدا دەچەسپێ، لەوانە دەتوانرێ هەریەك لە ئەلەمنیۆم و شووشە چەندین جاری ترو بە شێوازی جیا بەکاربهێنرێتەوە، بەرلەوەی تێك بشکێنرێ و فڕێ بدرێ، یاخود بۆ دووبارە داڕشتنەوە و لەقالب گرتنیان بەرەو کارگەکان ببرێن، دەرکەوتووە ئەو وزەیەی بۆ دووبارە دروست کردنەوەی پەرداخێکی شووشە خەرج دەکرێ، دەتوانێ بۆ ماوەی (٤) کاتژمێر گلۆپێکی (١٠٠) ولتی دابگیرسێنێ و ژوورێك ڕووناك بکاتەوە.

هەرتەنێکیش لە شووشەی دووبارە بەکارهێنراوە (٦٠٠) کیلۆگرام قوم و (١٩٦) کیلۆگرام خۆڵەمێشی سۆداو (١٩٦) کیلۆگرام بەردی کلس و (٦٨) کیلۆگرام سلیکاتی ئەلەمنیۆم دەگێڕێتەوە. هەروەها بەرهەم هێنانی تەنێك شووشە لە ماددە خاوە ئاساییەکانی (١٧٤) کیلۆگرام پاشماوەی وردە ئاسنی لێ دەکەوێتەوە، سەبارەت بە دووبارە بەکارهێنانەوەی قوتوی ئەلەمنیۆمیش ڕێژەی (٧٥٪) ی وزەی بەکاربراوو (٨٥٪) ی پیس بوونی ژینگە و (٧٦٪) ی پیس بوونی ئاوو (٩٥٪) پاشماوە ڕەقەکان کەم دەکاتەوە، ئەوە ئەگەر ئەلەمنیۆم لە ماددە خاوە ئاساییەکانی خۆی دروست کرا.

هەروەها دووبارە بەکارهێنانەوەی تەنێك ئەلەمنیۆم وزەیەك

پاشەکەوت دەکات کە بەرامبەر (٨٨٩٦) لیتر بەنزین دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو برە ئەلەمنیۆمە لە ماددە خاوە ئاساییەکانی دروست کرا، ئەوە پێویستی بە چارەسەرکردنی (٣٢٩٠) کیلۆگرام قوڕی سووروو (١٢١٥) کیلۆگرام گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و (٣٦) کیلۆگرام هەوای پیس و (٣٥٨) کیلۆگرام پاشماوە ڕەقەکان دەبێت .

کەواتە جێگای خۆیەتی تا بکرێ زیادەڕۆیی لەبەکارهێنانی ئەو ماددانە نەکەین و لە کاتی کۆکردنەوەی زبڵ و پاشماوەکانیش شێوازێکی زانستی و گونجاو پیادەبکەین بەوەی کە ماددە بێ کەڵکەکان لەیەکتری جیابکەینەوە. چونکە هەریەك لەم ماددانە کە پێکهاتەیەکی کیمیاوی جیایان هەیە و شیکرنەوەو تێکەڵ بوونیان بەیەکەوە زیانیان بۆ سەر ژینگە زیاتر دەبێ و دەبنە هۆی ژاراوی بوونی ئاوی ژێر زەوی و بەهەوادا دەچن و کاریگەری زۆر خراپیان بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ دەبێ.

بەو هیوایەی لەمەودوا ڕێ و شوێنی دروست بۆ کۆکردنەوەو جیاکردنەوەی زبڵ و پاشماوەکان بگرینە بەرو کارگەو دامەزراوە تایبەتیەکانیشمان بتوانن سوود لە کەلوپەلە لە کارکەوتووەکان و فڕێ دراوەکان وەربگرن، دووبارە دروستیان بکەنەوەو کەلوپەل و کاڵای جوانترو چاکتریان لێ دروست بکەن .

لەپێناو ژینگەیەکی پاك و ئابووریەکی بەهێزو ژیانێکی ئاسوودە بۆ سەرجەم خەڵکی کوردستان .

## چەمکی ژینگەو جۆرەکانی و پەیوەندیان بە مرۆڤەوە

ژینگە چەمێکێکی باوەو زۆر بەکاردەهێنرێ، ماناکەی گوزارشت لەپەیوەندی نێوان خۆی و نێوان بەکارهێنەرەکەی دەکات. بۆ نموونە دەڵێین ژینگەی کشتوکاڵی، ژینگەی پیشەسازی، ژینگەی تەندروستی، ژینگەی کۆمەڵایەتی، ژینگەی رۆشنبیری و ژینگەی سیاسی، واتە چالاکیە پەیوەندیدارەکانی مرۆڤ بەهەریەك لەم بوارانە...

وشەی (Ecolog) یش بەمانای زانستی ژینگە دێت و زانای ئەڵمانی – ئەرنست هیگل (Ernest Heackel) لە ساڵی ١٨٦٦ ز داینواە و لە ئەنجامی لێکدانی دوو وشەی یۆنانی پەیدابووەکە (oikes) واتە خانوو و (Logos) بەمانای زانست دێت، بە لێکدراویش واتە ئەو زانستەی کە لە پەیوەندی زیندەوەرە گیانیەکان لەگەڵ ئەو نێوەندەدا دەکۆڵێتەوە کە تیایدا دەژین . هەروەها زانستەکە گرینگی بە زیندەوەرەکان و خۆراکەکانیان، شێوازی ژیانیان و بوونیان لە کۆمەڵگاو کۆمەڵە نیشتە جێکان و گەلاندا دەدات، سەرباری ئەوانە لە فاکتەرە نازیندەگیەکانی وەکو خەسڵەتەکانی ئاوو هەوا (گەرمی، شێ، تیشکدانەکان، گازەکانی ئاوو هەوا) و هەروەها لە خەسڵەتە فیزیاوی و کیمیاویەکانی زەوی و ئاوو هەوا دەکۆڵێتەوە. زاناکان ئێستا لەسەر ئەوە کۆکن کەوا چەمکی ژینگە هەموو ئەو بارو دۆخ و فاکتەرە دەرەکیانە دەگرێتەوە کە زیندەوەرەکان تێیدا دەژین و کار لەو پرۆسانە دەکات کە ئەنجامی

دەدەن. بۆ نموونە ژینگە سەبارەت بە مرۆڤ واتە ئەو چوارچێوەیەی کە تیایدا دەژی و خۆڵ و ئاوو هەواو هەموو پێکهاتەکانی ئەو سێ ڕەگەزە سەرەکیە دەگرێتەوە. جا پێکهاتە بێ گیانەکان بن یاخود ئەوانەی گیانیان تیایەو دەژین. ئەو چوارچێوەیەش چەندین دیاردەی جۆرلو جۆری وەکو کەش، ئاوو هەوار، با، باران، کێشان و موگناتیسیەت – پەیوەندیە ئاڵۆگۆڕەکانی نێوان ئەو ڕەگەزانە لەخۆدەگرێ. بۆیە ئاخافتن لەسەر ژینگە، واتە لێدوان لە پێکهاتە سروشتیەکان و ئەو باروداۆخ و فاکتەرانەی زیندەوەرەکانی تیا دەژی، توێژەرانیش ژینگەیان بۆ دووبەشی سەرەکی دابەش کردووە کە ئەمانەن:

١- ژینگەی سروشتی/ لەو دیاردانە پێك هاتووە کە مرۆڤ هیچ دەسکەوتێکی لەبوون و بەکارهێنان و دیاردەکانیدا نەبووە، وەکو بیابان، دەریاکان، ئاووهەوا، بەرزی و نزمی زەوی ، ئاوی سەر ڕووی زەوی، ئاوی ژێر زەوی، ژینگەی ڕووەکی و ئاژەڵی، ژینگەی سروشتیش کاریگەریەکی ڕاستەوخۆی لەسەرژیانی هەرکۆمەڵەیەکی زیندوو (popula tion) دا هەیە جا ڕووەکی بێ یا ئاژەڵی یاخود مرۆیی.

٢- ژینگەی دروست کراو (بونیاتنرلو) / لەو بونیاتە بنەڕەتیە ماددیانە پێك دێت کە ئادەمیزاد دروستی کردووە هەروەها دەکرێ لەو گۆشەیەوە لە ژینگەی بونیاتنراو بڕوانین کە کۆمەڵگاکان چۆن شێوەی ژیانی خۆیانی پێ ڕێك دەخەن و توانرا لە ڕێگەیەوە ژینگەی سروشتی بۆ خزمەت و پێداویستسە مرۆییەکان بگۆڕدرێ.

ژینگەی بونیاتنراو هەروەها بەکارهێنانی زەویە کشتوکاڵیەکان و زەوی نیشتەجێ بوونی ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە بۆ سامانە سروشتیەکان دەیان پشکنین، سەرباری ناوچە پیشەسازیەکان و بنکە بازرگانی و قوتابخانەو ئامۆژگاو زانکۆو ڕێگەو بانەکان.
ژینگەش بە هەردوو باڵەکەیەوە (سروشتی و بونیاتنراو) پێکهاتەیەکی گشتی و تۆکمەیە، هەموو گۆی زەوی یاخود ئەستێرەی مرۆڤ نشین دەگرێتەوە، لەگەڵ کاریگەری گشت ئەو پێکهاتانەی تری گەردوون و پێکهاتەکانیش بەگشتی وەستاوو چەقیونین، بەڵکو کاریگەریەکی بەردەوامیان هەیە و لەگەڵ مرۆڤ خۆیدا کار لە یەکتری دەکەن. چونکە مرۆڤیش پێکهاتەیەکی کارای ئەو ژینگەیەیە. ئەم لێکدانەوەیەی پێشوو لەلایەن (یوپانت) ی ئەمیندارى پێشووتری نەتەوەیەکگرتووەکان دەربڕاوە کە دەڵێ (ئێمە بمانەوێ یا نەمانەوێ هەمووومان بەیەکەوە لەسەرپشتی یەك ئەستێرە کۆچ دەکەین، هیچ شتێکی تریشمان بەدەستەوە نییە، تەنها کارکردن نەبێ بەیەکەوە، بۆ ئەوەی بیکەینە ژینگەیەك، بەڵکو ئێمەو منداڵەکانمان بتوانین ژیانێکی ئارامی تیا ببەینە سەر).
ئەم داواکاریە وا لە ئادەمیزاد دەخوازێ کە تاکە گیانلەبەرو پێکهاتەی ژیری ئەو گەردوونە پان و بەرینەیە بەهێواشی و سۆزەوە مامەڵە لەگەڵ ژینگەدا بکات بەبێ تێکدان و ئازاردانی و وەبەرهەمی بێنێ و سوودی لێ وەرگرێ. دووریش نییە تێگەیشتنی سروشتی ژینگە و پەیوەندیە بەرامبەرەکانی نێوان سەرجەم پێکهاتەکانی، بواری ئەوە بۆ مرۆڤ بڕەخسێنێ شوێنێکی تازەو پێشکەوتووترو لەبارتر بۆ ژیانی خۆی و نەوەکانی دواتریش بدۆزێتەوە و ژینگەو

دەوروبەرەکەی بە پاك و خاوێنی ڕابگرێ و زیان بەسەرچاوەکانی ژیان و خاك و خۆڵ و ئاوو هەوا نەگەیەنێ و زێدەڕۆیی لەبەکارهێنانی هیچ کامیان نەکاو بەپێی پێویست و توانا بەکاریان بێنێ، بەو هیوایەی ئێمەش لە کوردستاندا سوود لەو لێکۆڵینەوە زانستیانە وەرگرین کە گرینگی بە مەسەلەیەکی هەستیاری وەکو ژینگە دەدەن و جەخت لەسەر پاراستنی و ئازار نەدانی دەکەنەوە لە پێناو جوان ڕاگرتنی ژینگەی ولاتە شیرینەکەمان و دەست گرتن بەسەرچاوە سروشتیەکانی و دابین کردنی ژیانێکی خۆش و ئاسوودە بۆ خەڵکی کوردستان .

# له پێناو نەهێشتنی ئەو دیاردانەی ژینگەی شارەکان پیس دەکەن

مەسەلەی جوان ڕاگرتنی سیمای شارو ڕێکخستن و دابەش کردنی پیشەو کارخانەکان لە جیهاندا بایەخێکی زۆری پێ دەدرێ و بەیەکێك لە ئەرکە هەمیشەییەکانی شارەوانیەکان لەقەڵەم دەدرێ. هەر لەبەر گرینگی ئەم مەسەلەیەش لە شارەوانی وبەشە خزمەتگوزاریەکانی زۆربەی شارە پێش کەوتووەکانی دونیادا، بەشێك بەناوی (پلان دانانی تەلارسازی) کراوەتەوە، تا وەکو ئەرکی دابەش کردنی زەوی و زار و جۆری زەویەکان و ڕووبەرو شوێنەکەیان بەشێوەیەکی زانستی بە لەبەرچاوگرتنی سەرجەم فاکتەرەکان لەگەڵ ئەو دامەزراو تەلارانەدا بگونجێ کە لەسەری دا دەمەزرێ و شوێنی تایبەت بۆ هەموو جۆرە پیشەو کارێك تەرخان دەکا لەگەڵ ڕێژەی دانیشتوان و پێداویستیەکانی شارەکەدا بگونجێ و نەبێتە هۆی دروست بوونی قەڵەبالغی و جەنجاڵی هاتوچۆو ناڕەحەتی و بێزاری هاووڵاتیان و پیسبوونی ژینگەو شێواندنی سیمای جوانی شارەکان، لەبەرئەوەی تەرخان کردنی شوێنێك بۆ ناوچەی پیشەسازی، فرۆشتنی کەلوپەلی یەدەگی ئۆتۆمبیل، فرۆشتنی دانەوێڵە، دەزگا بازرگانی و خزمەت گوزاریەکانی دەوڵەت، دەبێ بەپێی چەند مەرجێك و لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە بێت کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا، چونکە ئەگەر کردنەوەی شوێنی هەرپیشەو جۆرەکارو کاسبیەك ڕەمەکیانە بێ و هیچ مەرجێکی جوان

ڕێکخستنی شارو تەندروستی و شارستانیانەنە بوو ئەوە شارسیمای

گونـدێکی گـەورەی پـەرت و بـڵاو وەردەگـرێ و نـاڕێکی و بـێ

بەرنامەییەك دروست دەبێ کە چارەسەرکردنی سانا نەبێت و دەبێتە

هۆی بێزاری و ناڕەزایی دەربڕینی خەڵك و ژیان و ژینگـەی شـارەکان

تێك دەچێ.

کـە ئێمـە لـەم گۆشـەیەدا مەبەسـتمان زیـاتر لەسـەری بوەسـتین و

جەختی لەسەربکەینەوە، چونکە تێکچوونی ژینگەی هـەر یەکەیـەکی

نیشتەجێ بـوون و پـشتگوێ خـستنی و گرینگـی نـەدان بـە خـاوێنی

دەورووبەر، سەرچاوەکانی ناو ڕێگاوبان و شـەقامەکان، خـۆڵ و ئـاوو

هەوا، پەیدابوونی دووکەڵی پیس و دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوێکی زۆری

ئۆتۆمبیـل لـە نزیـك مـاڵان و نـاو گەڕەکەکانـدا، ژیـان تـاڵ دەکـاو

تەندروستی هاوڵاتیان دەخاتە مەترسیەوەو ئەگەری تووشی بـوونی

چـەندین نەخۆشـی ترسـناکی لێ دەکەوێتـەوە، فـەرامۆش کردنـی

ئەمانەش ژیان لە شارەکان دەخاتـە بـەردەم چـەندین مەترسـیەوە،

دیـارترین نموونـەی ئـەم حاڵەتـەی سـەرەوەش زۆربـوونی دوکـان و

وەرشەکانی چـاککردنەوەی ئۆتۆمبیلـە لـە هەنـدێك لـە گەڕەکـەکانی

شـاردا کـە چـەندین زیـانی گـەورەی لێ دەکەوێتـەوەو بەڵگەیـەکی

ڕوونیشە لەسـەر گـوێ پـێ نـەدانی ئـەو کاسبکارانە بـەهیچ مـەرج و

یاسایەکی شارەوانی و تەندروستی و کـەم دەسـتی و بـێ دەسـەڵاتی

شارەوانیش دەردەخا کە سەرەتا نەیتوانیوە شوێنێکی لەبار بۆ ئـەو

جـۆرە پیـشە گەرانـە تـەرخان بکـات و دواتـر لـە شـوێنی ئێـستایان

دووربخاتـەوە و ڕێگایـان نـەدا چـیتر ئـەم جـۆرە پیـشانە لـەناو

گەڕەکەکاندا تەشەنە بکات، چونکە ئەنجامدانی ئـەم جـۆرە پیـشانە

سەرباری ئەوەی هەروەك ئامازەی پێ کرا دەبێتە هۆی قەڵەبالغی و ڕاگرتنی ئۆتۆمبیلێکی زۆر لەسەر شۆستەو شەقامەکان و ڕێگەگرتن لە هاتوچۆی خەڵك، پاشماوەیەکی زۆری ماددە پیسەکانی وەکو ڕۆن و کەلوپەلە لە کارکەوتووەکان لەو شوێنانە کۆدەبێتەوەو ژینگەو ئاووهەوای گەڕەك و دەوروبەرەکەی پیس دەکات و لەهەریەك لەو کۆمەڵە دوکانانە نیمچە زبڵخانەیەك دروست بووەو کۆمەڵە ئاسن و تایە و پاشماوەیەکی تر بەسەریەك گرد کراونەتەوە. ئەم دیاریدە ناوازە تەشەنەسەندووە سیمای پایتەختی بەتەواوی شێواندووە و ژیان و حەوانەوەی خەڵکەکەی دەوروبەری ناخۆش کردووە و بووەتە مایەی بێزاری و ڕەخنە گرتنێکی بەردەوام لە دامودەزگا پەیوەندیدارەکان کە ناتوانن سنوورێك بۆ ئەم حاڵەتانە دابنێن، بەڵکو زۆر لە هاووڵاتیان ناچاردەبن لەو گەڕەکانە بگوازنەوەو ڕوو لە گەڕەکێکی تربکەن، بەداخەوە لە زۆربەی وڵاتانی دونیاد بۆ ڕازاندنەوەی شارە گەورەکان و خاوێن ڕاگرتنی و دابین کردنی ئاوو هەوایەکی پاك و پاراستنی ژینگە سەرباری چەندین پشتێنەی سەوزی دەوروبەری شارەکان چەندین باخچەی گشتی و سەیرانگا دەکرێتەوە، لە زۆربەی شارەکانی کوردستانیش بە پایتەختیشەوە لەپاڵ ئەوەی کە ناوچە سەوزاییەکان لف کراون و شوێنە تەرخان کراوەکانی فرۆشراون و کراونەتە باڵەخانەو سوپەرمارکێت و بەنزینخانە و ڕێزە دوکان. کە دواتر ئەو دیاردەیەشی بەسەرداهات و ڕێزە دوکانێك لەسەرشەقامی تەسکی ناو گەڕەکەکاندا بکرێتە ناوچەیەکی پیشەسازی بچووك. لە دوای خستنە ڕووی ئەم گرفتە و دیاردەی سەرەوە وا دەردەکەوێ کە پێویستی بە چارەسەرکردنێکی

بەپەلـە هەیـە. ئەگـەر نـەبوونی شـوێنی بـەدیل و زیـان نەگایانـدن بەبەرژەوەندی توێژێکی کاسبکارو لەدەستدانی بژێویان بیانوو بێت بۆ لابردن و دوورخستنەوەی ئەم جۆرە پیشانە لـەناو گەڕەکـەکان، ئەوە هیچ یاسایەك بەسۆزو پاڕانەوە جێبەجێ ناکرێت و ناچەسپێ. ئەو دیاردەیە چیتر خۆڵ بێدەنگ کردن قەبووڵ ناکات. چونکە دیارە پاراستنی ژینگە و خاوێنی شارو تەندروستی هاوولاتیان بەگشتی و تێکدانی سیمای پایتـەخت کـە مەڵبەنـدی بڕیاردانی کـوردو جێگـای حکومـەت و سـەرجەم دامودەزگـا گرینگـەکانی تـرو سـەنتەرێکی ڕۆشـنبیری و شارسـتانی گـەورەی کوردسـتانە، لەسـەرووی بەرژەوەندی چەند کەسێکەوەیە . کە پێشتر سەرپێچیان کردووەو ئەو پیشەیان لـەناو جەرگـەی شـار دامەزرانـدووە. بۆیـە ئـەم وتـارە بانگەوازێکـە تـا هـەموو لایەنـە پەیوەندیـدارەکان بـە جـددی لـەو دیاردەیە بخۆن و پایتەختی هەرێم لە پاشماوەکانی ئـەم پیشەیەو کاریگەرییە خراپەکانی پاك بکەنەوە بەهیوا چاوەڕوانین..... ! !

## کامەیان چاکترە پەنجەرەکان بکەینەوە یان بۆن خۆشکەرەوە بەکاربێنین؟

ئێمە زۆر جار لەماڵەوە یا لە نووسینگەکان و شوێنەکانی کارکردندا بۆ گۆڕینی هەوای ژوورەکان، لە جیاتی کردنەوەی دەرگاو پەنجەرەکان بۆنێکی خۆش بەکاردەهێنین کە بە( بۆن خۆشکەرەوەی هەوا) ناودەبرێ، ئەگەر چی لە ڕاستیدا ژەهرشوێنی لێپرژانی پیس و ژاراوی دەکات. تەنانەت لەش و سەروچاوو جلوبەرگیشمان لەو ژارانە بێبەش نابن، بۆیە بەر لەوەی هیچ کام لەو (بۆن خۆشکەرەوانە) بەکاربێنین پێویستە لە جۆروپێکهاتەکانیان بگەین، ئەوانەش دووجۆرن.

١- بۆن خۆشکەرەوەی (سپرای) واتە بە پرژاندن .

٢- بۆن خۆشکەرەوەی فتیل، واتە بە گرتێبەردان و سووتاندن.

زیانەکانی بۆن خۆشکەرەوەکانی هەوا:

ئەو ماددانە، هەوای هەڵمژراو پاك و چاکتر ناکەن، بەڵکو پیسی دەکەن، زیان بەهەستی بۆن کردن دەگەیەنن و ژەهرێك بڵاودەکەنەوە کە لووت و سییەکان دووچاری سووتانەوە دەکات و چەندین گرفتی ترسناکیشی بەدوادادێت، چونکە گازی فۆرمالدیهاید

وەکو ماددەیەکی سەرەکی دەچێتە پێکهاتەی زۆربەی ئەو بۆنە خۆشانە. ئەو گازەش هەر چەندە بێڕەنگە، بەلآم بۆنێکی تیژی هەیەو هەستی بۆن کردن و ئامێری هەناسەدان تێك دەداو بە یەکێك لە فاکتەرە سەرەکیەکانی تووش بوونی شێرپەنجەو هەناسە تەنگی و پەتای سییەکان لەقەڵەم دەدرێ. ئەمەی خوارەوەش لیستێکە بەناوی ئەو ماددە کیمیاویانەی کە بۆن خۆش کەرەوەکان پێك دەهێنن:

١- کحول ئە پیلی.

٢- ئیپیلی جیلیکۆل.

٣- ئاو

٤- ئیپانۆل.

٥- مۆم.

٦- کلۆریدی میپیلین.

٧- پێکهاتەی فینۆل و ترشی سلفۆنیك.

٨- ڕۆنی سنەوبەر.

٩- دووم کلۆریدی بەنزین.

١٠- پێکهاتەی فینیل و ترشی کریۆلیك .

جا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە زیان و مەترسیەکانی ماددە بۆن خۆشکەرەوەکان بن، کەواتە چی بکرێ باشە:

١- خاوێن کردنەوەی بەردەوامی ژوورو نووسینگەکان.

٢- هەوا گۆڕینی باش، بە کردنەوەی دەرگاو پەنجەرەکان.

٣- ڕزگاربوون لەسەرچاوەکانی بۆنی ناخۆش و بۆگەنی ناو

ماڵ و نووسینگەکان هەروەها خواردنی کۆن ...هتد

٤- ڕزگاربوون لە پاشماوەی زبڵ و پیساییەکان.

٥- بەکارهێنانی (بیکاربۆناتی سۆدا) لەناو بەفرگرەکان بۆ هەڵمژینی بۆنە ناخۆشەکان.

٦- دارچاندن و زۆرکردنی ڕووەك لە شوێنی حەوانەوەو دانیشتندا.

# کاریگەریە ژینگەییەکانی پاشماوە ڕەقەکان و چۆنیەتی کۆکردنەوەیان

پرۆسەی دووبارە بەکارهێنانەوەی پاشماوە ڕەقەکان گرینگیەکی زۆری هەیەو سەرباری ئەوەی فاکتەرێکی بەهێزی پاککردنەوەی ژینگەیە، لەهەمان کاتدا قازانجێکی ئابووری زۆریشی هەیە، زۆر لە وڵاتە پێش کەوتووەکان و تەنانەت دەوڵەتە تازە پێ گەیشتووەکانیشی بایەخێکی زۆر بەو مەسەلەیە دەدەن و تێچووەکی زۆری بۆ تەرخان دەکەن. هەروەها چەندین کارگەیان بۆ دووبارە بەکارهێنانەوەیان کردۆتەوە.

مەسەلەی دووبارە بەکارهێنانەوەش Recycling بە کورتی بە کۆکردنەوەی ئەو کەلوپەل و ماددە بەکارهێنراوە پێناسە دەکرێ کە لێرەوە لەوێ فڕێ دراون و پاشان دووبارە بەکارهێنانەوەیان (Reuse) جا لە هەمان شێوەی کۆنی خۆیان بێ یا لە دروست کردنی شێوەو ماددەی تازەدا، سوودە ژینگەییەکانی ئەو دووبارە بەکارهێنانە لەوەدایە کە پاشماوە فڕێ دراوەکان کەم دەبنەوەو ئەو پیسی و ناڕێکیە نامێنێ، بەڵام قازانجە ئابووریەکانی لەوەدایە کە کەمتر پێویستیمان بە ماددە خاوەکان دەبێ و ئەو کاڵایانەی لە دووبارە بەکارهێنانەوەی ماددە بێ کەڵکەکان دەستمان دەکەون نرخەکانیان هەرزانترەو زۆرتر دەست دەکەون و لە دروست

کردندا تێچووەکی کەمتریان دەوێ وەکو ماددە پلاستیکیەکان و شوشەو کاغەزو ئەلەمنیۆم و ئاسن و .... هتد.

ئەوەی ئەمڕۆش لە ولآتی ئێمە و تەنانەت لە دەورووبەریشدا هەیە، بایەخێکی زۆر بەو لایەنە گرینگە نەدراوە و هیچ کارگەیەکی گەورەی لەم بابەتە نییە ئەو هەموو پاشماوەو تەنە گەورە ئاسنانە کۆبکاتەوەو دووبارە بەکاریان بێنێتەوە، تەنها چەند کارگەیەکی کەم نەبێ کە لەلایەن کەرتی تایبەتەوە بەڕێوەدەبرێ و کراوەتەوە. وەکو کارگەکانی تواندنەوە و دووبارە بەکارهێنانەوەی پلاستیك و قورقوشم و مس و ...هتد ئەو کارگە بچووکانەش تەنها چارەسەرێکی کەمی ئەو هەموو پاشماوە کۆنە ئاسن و کەلوپەلە فڕێ دراوە دەکات و ناتوانێ ژینگەکە بە تەواوی پاك بکاتەوە و ئەو قازانجە ئابووریەی لێ بێتە دی کە چاوەڕوان دەکرێ. زۆر لە توێژەران هۆی کەڵەکە بوونی ئەو هەموو پاشماوە ڕەق و ئاسنینە بۆ زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوان و زیاتر بەکارهێنانی بەرو بووم و کەلوپەلەکان دەگەڕێننەوە بەتایبەتی باش بوونی ئاستی گوزەران حاڵەتێکی وای دروست کردووە کەلوپەلێکی زۆر فڕێ بدرێ و کەلوپەلی تازە بکڕێ و کۆنەکە چاك نەکرێتەوە و بەکارنەهێنرێتەوە. لە زۆر حاڵەتیشدا ئەو پاشماوانە دەسووتێندرێن ، بەلآم ئەویش چارەسەرنییە و زیانێکی زیاتری لێ دەکەوێتەوە، چونکە لە کاتی سووتاندنیدا ژینگە پیس دەکاو هەوایەکە بۆگەن و ژاراوی دەکاو دووکەڵێکی زۆری زیان بەخشی لێ دەردەچێ و خۆڵەمێش و پیسیەکی زیاتری لێ

دەکەوێتـەوە. بۆیـە کۆکردنـەوەی ئـەو هـەموو پاشماوانـەو ڕەوانـــەکردنیان بـــۆ کارگـــە تایبەتیـــەکان و دووبـــارە بەکارهێنانەوەیان بە چاکترین چارەسەری ئەو حاڵەتە لەقەڵەم دەدرێ، بۆیە پێویست دەکات دەست بە کۆکردنەوەی کەلوپەل و پاشمـاوە ڕەق و گـەورەکان بکـرێ بـە تایبـەتی هەیکـەلی ئۆتۆمبێل و کۆنە ئاسن و پاشماوەی ئامێرە کارەباییەکانی نـاو ماڵ و لایەنە پەیوەندیدارەکان کارگەی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە دابمـەزرێنن، بـەڵکو بەهۆیـەوە لەلایـەك ژینگـەی وڵاتەکـەمان و شارە گەورەکان پاك دەکەنەوە.

لەلایەکی تردا سوودێکی ئابووری زۆری دەبێ و کەلێنێکی زۆری پـێ پڕدەکرێتـەوەو دەبێتـە هـۆی بـەهێزکردنی ئـابووری وڵاتەکـەمان و مایـەی خۆشـی گـوزەرانی و خۆشـی و پـاك و خاوێنی کوردستان و پایتەختی شیرینەکەی بەتایبەتی ....

## پیس بوونی ئاو و کاریگەریەکانی بۆ سەر ژینگە

ئـاو شـلـەیەکی سـەرەکی و پێویـستی ژیانـە و نـاکرێ هـیچ کـام لـە گیانلەبەرو زیندەوەرەکان دەست بەرداری بن، گۆی زەویش لـەناو ئەستێرەکانی تردا ئەو تایبەتمەندیەی هەیە کە ئاوی بە ڕێژەی یـەك تیایە ژیانی تیا دروست ببێ و بەردەوام بـێ. ئـاو خۆشیی بەڕێـژەی ٥٠٪ تا ٦٠٪ کێشی خانەی زیندوو پێك دەهێنێ و بەڕێـژەی ٧٠٪ لـە کێشی سەوزەو میوەجاتدا هەیە زۆرجاریش ئەو ڕێژەیە دەگاتـە ٩٠٪ .

گرینگی ئاویش بۆ مرۆڤ بەپلە دوو، واتە دوای ئۆکسجین دێـت. بۆیـە ئەگەر پاك و خاوێنی و سازگاری لە سنوورە دیارکراوەکانی خۆی تێپەڕی، ئەوە مرۆڤ لە ڕێگایـەوە زیـانێکی زۆری پێـدەگات . ئـاویش لەسەرچاوە سروشتیەکانیەوە دووچاری چـەندین جـۆرە پـیس بـوون دەبێتەوە کە هەندێکیان کیمیاوین و بەشێکیان بایۆلۆژین.
بڵاوبوونەوەی ئەو هەموو جۆرەی پیس بوونی ئاویش شان بە شـانی گەشەکردنە شارستانی و پیشەسازی و مەدەنی لە تەشـەنەکردندان. کە پێویست دەکات ڕێ و شوێنی دروست و چارەسەری پێویستی بۆ بکرێ و پێوەری بۆ دابندرێ و یاسای توندو بەجێی بـۆ دابڕێـژرێ تـا وەکو ئاستێك بۆ ئەو جۆرە پـیس بوونـەی ژینگـە دابنـدرێ، چـونکە پیسبوونی ئاو چەندین مەترسـی جۆراوجـۆری بـۆ ژیـانی سـەر ڕووی زەوی هەیـە. جـاران بۆچـوونێکی هەڵـە هـەبوو پێـی وابـوو ڕووبـارو دەریاچەو ئۆقیانووسەکان لەبارترین شوێنی کۆکردنەوەو تێ فڕێدانی

پاشماوە و پیسایی شارەکان و پاشەڕۆکە پیشەسازیەکانن، لەگەڵ هەر پاشماوەیەکی تر کە بمانەوێ لێی ڕزگاربین، ئەم تێکەیشتنە نا دروستە هەر ڕووبارەکانی وڵاتە دواکەوتوو و تازە پێگەیشتووەکانی نەکردۆتە زبڵدان و شوێنی حەشاردانی پاشماوە پیشەسازیە ژارلوی و ترسناکەکان، بەلکو ڕووبارەکانی وڵاتە پیشەسازی و پێشکەوتووەکانی ڕۆژئاوایش بەهەمان شێوە دووچاری هەمان دەردبوون. وەکو ڕووباری (ڕاین) بەتایبەتی ئەو بەشەی کە بەخاکی هۆڵەندا ڕەت دەبێ، چونکە ڕێژەی پیسبوون لەم ڕووبارە لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوودا زۆر بەرز بووە، ڕێژەی پیسبوونی ئەم ڕووبارەش تا لە ئۆقیانووس نزیك بکەوێتەوە کە ڕووبارەکە لە دواقۆناغدا تیایدا دەڕژێ، ڕێژەی پیسبوونی زیاتر دەبێ.
بۆ نموونە لە کاتی ڕژانە ئۆقیانووسیدا دەگاتە (٢٠٪) ی ئاوی ڕووبارەکە.
پیسبوونی دەریاچەکانیش لە زۆربەی وڵاتە دواکەوتووەکاندا زیانێکی ئابووری زۆری لێکەوتووە. بۆ نموونە چەندین دەریاچە لە وڵاتی میسر لەبەر زۆرتێ فڕێدانی پیسایی و پاشماوە پیشەسازیەکان، بووەتە هۆی لە دەستدانی زۆربەی ماسی و گیانلەبەرە ئاویەکانی تر. لە چەندین ئەنیستیتۆی تایبەت بە زانستە دەریاییەکانیشدا هاتووە کەوا بەهۆی نقومبوونی چەندین کەشتی لەهەردوو دەریای سپی و سووردا و دزەکردنی نەوت لە بەندەرەکاندا ڕێژەی پیس بوونی ئەو دوو دەریایەی بەرزکردۆتەوەو بووەتە هۆی کوشتنی بێچووە ماسیەکان و دووچاربوونی ماسیە گەورەکانی تر بە چەندین نەخۆشی ترەوە، سەرباری ئەوەی لە کەنارەکانیشدا لەبەرزۆری

ژمارەی گەشتیاران و ئەو خەڵکەی لە شارەکانی کەنار دەریاکاندا دەژین، کەلوپەلێکی بێ کەڵکی زۆر فڕێ دەدرێتە ناو دەریاکان سەرباری ئاوی پیس و پاشماوە کشت و کاڵی و پیشەسازیەکانیش .
ئەگەر لایەك لەسەرچاوەی ئاوو دەریاچەکانی کوردستانیش بکەینەوە، سەرباری کەمی ڕووبارو دەریاچەکان و بێ بەشبوونی زۆربەی شارەکان لە خێرو بێری ڕووبارەکان کە بەناو شارە گەورەکاندا ڕەت نابن، بەڵام ڕووبارەکانی کوردستانیش بە ڕێژەی جیاجیا پیس و ژاراوەی کراون و پیسایی و پاشماوەیەکی زۆریان تێ دەکرێ وەکو پاشماوەی ئاوی ماڵان و جۆگەو کانیاوەکان. هەروەها دەریاچەکانی کوردستانیش سەرباری کۆبوونەوەی ئاوی ڕووبارەکان، گەشتیاران کە بۆ سەیران و کات بەسەربردن ڕوو لەو شوێنانە دەکەن. کەنار دەریاچەکان پیس دەکەن و پاشماوەو کەلوپەلێکی بێ کەڵکی زۆری وەکو خۆراك و دارو پلاستیك و شووشە دەکەنە ناو دەریاچەکانەوە، بەمەش زیانێکی زۆر بەو سامانە سروشتیە گەورەیە دەگەیەنن و ژینگەکەمان پیس دەکەن، کە جێگای خۆیەتی بایەخێکی زیاتر بەم مەسەلەیە بدرێ و ڕێگا نەدرێ دەست درێژی بکرێتە سەر ڕووبارو سەرچاوە ئاویەکانی کوردستان، هەروەها لایەنە پەیوەندیدارەکانی دابەش کردنی ئاوو ئاوەڕۆکان گرینگیەکی پتر بە پاك و خاوێنی ئەو ئاوە بدەن کە لە ڕێگای بۆ ریەکانەوە بۆ ماڵان دەگوازرێتەوە و کەسی خوێندەوارو شارەزا بۆ کارپێکردنی بیرە ئاوەکان دابنێن کەسەری لە ڕێژەی ئەو کلۆرو ماددە خاوێنکەرانەوە دەربچێ کە دەکرێتە ناو ئاوی خواردنەوە، هەروەها پەلە لە چاکردنەوەو داخستنی بۆ ریە شکاوەکاندا بکرێ کە

له زۆر شوێنی شارەکاندا بەرچاو دەکەون. چونکە لەلایەک ڕێژەیەکی زۆری ئاوی خواردنەوەمان بە فیڕۆ دەڕوا لەلایەکی دیکە بڕێکی زۆری میکرۆب و پیسایی دەچێتە ناو بۆریەکانی ئاوی خواردنەوە، بەو هیوایەی بە هەموو لایەکمان لە ئاستی ئەو لێپرسراویەتیەدا بین و ئەو سامانە سروشتیە بپارێزین و ڕێگەی پیسبوون و بەفیڕۆدانی لێبگرین لە پێناو ژینگەیەکی خۆش و پاک و خاوێن و کوردستانێکی ئاوەدان و ئایندەیەکی ڕۆشندا ...

## پاراستنی ژینگەو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی

مەسەلەی ژینگە ئەمڕۆ لە جیهاندا بایەخێکی زۆری پێ دەدرێ و بە یەکێك لە بابەتە گەرموگوڕەکان لە قەڵەم دەدرێ و لەوە تێپەڕی کردووە هەر تەنها خاوێن کردنەوەی شەقام و بەردەرگاو ڕێگاکان بێت، چونکە بابەتی ژینگە ئەمڕۆ پەیوەستە بە ژیانی هەموو هاوولاتیان و ئایندەی ولاتەوەو هەر لەبەر ئەم گرینگیەش لە ولاتە پێشکەوتووەکان چەندین پارت و ڕێکخراوو کۆمەڵەی تایبەت بە ژینگە دامەزراوە، ئەو پارتانەی کە داکۆکی لە پاراستنی ژینگە و ئازار نەدانی دەکەن، نەك هەر جەماوەرێکی زۆرو بارچاویان هەیەو حیسێبیان بۆ دەکرێ، بەڵکو لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا بە خستنەڕووی بەرنامەی کارو پێشکەشکردنی چاکسازیەکان ململانێ لەگەڵ حزبە سیاسیە گەورەکان دەکەن و ئاکامی هەڵبژاردنی هەندێك ولاتیش وا دەسەپێنێ کە هیچ تاکە حیزبێکی سیاسی بەتەنیا نەتوانێ حکومەت پێکەوە بنێ، بەڵکو ناچارین بە بەشداری و هاوکاری حیزبێکی ژینگە پارێز حکومەت ڕابگەیەنێ. لەوەش زیاتر حیزبە سیاسیەکانیش بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین دەنگ و مسۆگەر کردنی بەدەست هێنانی ئەنجامێکی باش یەکێك لەو بەڵێنانەی کەبەدەنگدەرانی دەدەن پاراستنی ژینگە و بایەخ دانە بە پاك و خاوێنی دەوروبەرو سامانە سروشتی و دەریاییەکان و زیان نەگەیاندن بە بەرگە هەوای زەوی، ڕێکخراوە ناحکومیە ژینگە پارێزەکانیش کە بە باڵێکی سەرەکی و بنەڕەتی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە قەڵەم دەدرێن، ڕۆڵێکی دیاریان لە پێش

کەوتنی کۆمەڵگاو سڕینەوەو قەڵاچۆکردنی ئەو دیاردانە هەیە کە زیان بە ژینگە دەگەیەنن و گوشارێکی زۆر دەخەنە سەر لایەنە پەیوەندیدارو ژینگە تێکدەرەکان و وەکو چاودێرێکیش بۆ هەر کەمتەرخەمی و سستی نواندنێکی ئەو بوارە لە بۆسەدان. هەر ئەو ڕێکخراوانەش خۆیان ڕۆڵێکی باڵا لە پاك کردنەوە و پاراستنی ژینگەدا دەگێڕن و هاوکاریەکی بەرچاوی لایەنە پەیوەندیدارەکان دەکەن. جا بە کۆکردنەوەو گواستنەوەی پاشماوەو پیساییەکان و شاردنەوەیان بێ، یان هاندانی خەڵك بۆ ڕێزگرتن لە ژینگەو ئازارنەدانی ژینگەو کردنەوەی سیمینارو کۆڕو خول فێرکردن و ڕاهێنان کە زۆرجار ئەنجامدانی ئەو ئەرك و کارانە بێ بەرامبەر و دەستکەوت بووە و خەڵکەکە لە خۆڕا خۆیان ناونووس کردووەو چاوەڕوانی هیچ مووچەیەك ناکەن. یاخود ئەو ڕێکخراوو کۆمەڵە ژینگە پارێزانە دەست پێشخەرن لە ڕاگرتن و ئیفلیج کردنی هەر سەرپێچی و زیان گەیاندنێکی چاوەڕوان کراو، واتە بەر لە ڕوودانی هەر کارەساتێکی ژینگەیی هەڵمەتێکی گەورە بەرپادەکەن و ئەگەر نەشتوانرا بە بەیاننامەو هۆشداری ڕێگا لەو جۆرە کردەوە زیانبەخشانە بگرن، ئەوە دەڕژێنە سەر شەقامەکان و بەمانگرتن و خۆپیشاندان لایەنە پەیوەندیدارەکان ناچاردەکەن لە بڕیارو هەنگاوەکانی خۆیان پاشگەز ببنەوە کە زۆرجار ئێمە ئەو ڕووداوو هەواڵانە لە میدیاکاندا دەبینین وەکو زۆر بەکارهێنانی سووتەمەنیەکان کە یەکێکە لە دەرهاویشتەکانی شۆڕشی پیشەسازی و ململانێی نێوان وڵاتە گەورەکان و کۆمپانیاکان کە گوێ بە هیچ مەرج و ڕێسایەکی پاراستنی ژینگە نادەن بۆیە

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەو وڵاتە ناچاردەکەن دەست بە دەرکردنی ئەو دووکەڵە زیان بەخشانەوە بگرن کە ڕێژەیەکی زۆری گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ($CO_2$) لە خۆدەگرێ و دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمایی زەوی و ناڕەحەت بوونی دانیشتوان.

پارێدەرۆیی کردن لەکارهێنانی ئەو ماددە زیان بەخشانەکە دەبنە ئەگەری درز خستنە چینی ئـۆزۆنی دەوری زەوی بەتایبەتی لە کاتێکدا کە زۆربەی وڵاتان پابەندی ئەو ڕێژە ڕێگەپێدراوە نابن کە بەپێی کۆنگرە نێو دەوڵەتیەکان بۆیان دەست نیشان کراوە. زۆرجاریش ڕێگە نادرێ کەشتییە (ئەتۆم) و ماددە (قەدەغە کراوە) هەڵگرەکان لە کەنارەکانی هیچ وڵات و شارێکدا لەنگەر بگرێ، یاخود کەشتیەکی نەوت هەڵگر لە یەکێك لە دەریا و ئۆقیانووسەکاند پەکی دەکەوت و درزی تێ دەکەوت و نەوتەکە دەڕژایە ناو ئاوی دەریاکانەوە. ژینگە پارێزان و ڕێکخراوەکان بەر لە زیان گەیاندن بە ماسی و گیانلەبەرە دەریاییەکان، ئەو جۆرە کارانە پرۆتستۆ دەکەن و ڕێپێوان و خۆپیشاندان سازدەکەن. بەو ئومێدەی ئێمەش لە کوردستانی ئازاددا کە لە کۆڕ کۆبوونەوەو وتارو نووسینەکانماندا بانگەشەی کۆمەڵگای مەدەنی دەکەین و داکۆکی لێدەکەین.

بەبایەخەوە لەم مەسەلەیە بڕوانین ئێمەش لەم بوارەدا بگەینە ڕیزی کۆمەڵگا پێش کەوتووەکان و برەو بە پاراستنی ژینگە و ئازار نەدانی بدەین. لە پێناو ئەوەی بە مەدەنی بوونمان لە خانەی نووسین و گوتاردا بچێتە بواری پراکتیزەکردن و ئەو ژینگە پارێزیە ببێتە ڤیزەیەك بۆ پەڕینەوە بەرەو کۆمەڵگایەکی پێش کەوتوو و مەدەنی و هوشیار...

## پیسبوونی کارەبایی ژینگە و چۆنیەتی خۆلێ پاراستنی

پیسبوونی کارەبایی چەمکێکی تازەیەو دەچێتە سەر لیستی جۆرەکانی تری پیسبوون کە ژینگە و دەوروبەرەکەمان بێزەوەرو ناشیرین و پیس دەکەن وەکو پیسبوونی کیمیاوی بایۆلۆژی ...هتد، هەرچەندە مرۆڤیش لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە کارەبای بەکارهێناوە، بەلاّم کاریگەریەکەی لە بیست ساڵی دواترو ئەو چەند ساڵە کەمەی دواییدا تەقینەوەیەك لەبەکارهێنانی ئامێرە کارەباییەکان ڕوویداوە ئامێرە پێش کەوتووەکانی وەکو کۆمپیوتەرو مۆبایل و ئامێرە کارەباییەکانی ناو ماڵی وەکو فڕنی مایکرۆیف و سۆبەی زەیتی و زۆربوونی ئامێرەکانی تەلەفزیۆن لە ساڵانی دواییدا بەهۆی باشبوونی باری گوزەرانی خەڵك و کڕینی کەلوپەلەکان ڕووی لە زیادبوون کرد بەتایبەتی دوای زۆربوونی ئامێری سەتەلایت لە زۆربەی ماڵەکاندا. گشت ئەو ئامێرانە بەیەکەوە بەشداری لە زۆربوونی بڕی وزەی کارەبایی بەکاربەرو ئەو بوارە موگناتیسیە دەکەن، کە بەهۆی ئەو بەکاربردنەوە پەیدا دەبن. بەڕادەیەك کە ماڵەوە و فەرمانگەکانمان بوونەتە بازنەیەکی کارۆموگناتیسی و لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوین. هەر بۆلێکۆڵینەوە لە کاریگەریەکانی پیسبوونی کارەبایی لەسەر مرۆڤ چەندین کۆنگرەی نێو دەوڵەتی سازکراوە و یەکێك لەو لێکۆڵینەوە گرینگانەی لەم دواییە لە وڵاتی سوێد ئەنجام دراوەو نیو ملیۆن هاووڵاتی گرتبۆوەو دەرکەوتووە کە وا ئەم منداڵانەی لەناوچەکانی نزیك هێڵەکانی کارەبا

Power Line دەژین چوارجار زیاتر لە منداڵەکانی تر دووچاری شێرپەنجەی خوێن دەبن. چەندین لێکۆڵینەوەش سەبارەت ئەو بوارە کارۆموگناتیسیە ئەنجام دراوە کە لە ئامێرەکانی مۆبایل و کۆمپیوتەرو فاکس و کۆپی کردن و هێڵەکانی کارەباوە دەردەچن و چەندین نەخۆشی وەکو ژانە سەرو بیرپەرت بوون و تەرکیز نەکردن و وشکبوونی پێست و چاوو منداڵ لەبەرچوون و نەزۆکی و کولك و کوانی مێشك و شێرپەنجەی خوێن. بواری کارۆموگناتیسیش لەچەند شەپۆلێکی بێ دەنگی نەبینراو پێك هاتووە و چەند لە سەرچاوەکە دووریکەویتەوە لاوازتردەبێ. ئەو شەپۆلانەش هەموو جۆرە ماددەیەك دەسمن و پیایدا ڕەت دەبن تەنها ئاسن نەبێ. هەرکاتێکیش ئامێرێك داگیرسێنین کە بوارێکی کارۆموگناتیسی دروست بکا، بەتایبەتی ئەگەر مرۆڤەکە زۆر لەسەرچاوەکەوە نزیك بێ. ئەوە سەرباری ئەو نەخۆشیانەی ئامازەیان پێکرا، دەبێتە هۆی تێکدانی پێکهاتەی خانەکانی مێشك. سەبارەت بە ئامێری مۆبایل کە ئەمڕۆ بە زۆری بەکاردەهێنرێت و کەم کەس هەیە ئەو ئامێرەی لە گیرفان نەبێ، تەنانەت لە زۆر خێزاندا چەند کەس بن ئەوەندە ئامێرەیان هەیەو لە ئاکامی چەند تاقیکردنەوەیەکدا کە لە سەر (مشك) ئەنجام دراوە دەرکەوتووە کە مۆبلیل چەند تیشکێك بۆ مێشکی (مشك) دەردەکا و دەبنە هۆی دووچاربوونی شێرپەنجەو لە دەستدانی کاتیی بیرەوەری و نەمانی تەرکیز. سەبارەت بە ئامێری کۆمپیوتەریش کە خەریکە ببێتە بەشێك لە پێکهاتەی ماڵەکانمان و هاوڕێیەکی نیمچە بەردەوامی زۆربەمان، توێژەران دەڵێن ئەگەر دوو کاتژمێری بەردەوام بەرامبەر کۆمپیوتەر دابنیشین دەبێ دوو

کاتژمێری تر چاوەکانمان بحەسێتەوەو لەو ئامێرە دووربکەوینەوە.

لەوەش ترسناکتر زاناکان دەڵێن ئامێرە کارەباییەکان چەند ئاڵۆزبن ئەوە مەترسیان بۆ سەرژیان زیاتر دەبێ و بەپێی سەرچاوە زانستیەکانیش پیاوان لە ئافرەتان زیاتر بەرگەی بواری موگناتیسیەکان دەگرن و دووریش نیە هۆی ئەو بەرگریە کەمەی ئافرەتان بۆ ئەو گۆڕانکاریە هۆرمۆنییە بەردەوامە بگەڕێتەوە کە لە لەشی ئافرەتدا ڕوودەدات. لەبەرئەوە لەو (١٥٠) ساڵەی دوایشیدا جیهان شۆڕشێکی کارەبایی چاوەڕوان نەکراوی بەخۆوە بینی ئەو شۆڕشە گەورە مەترسیەکی زیاتری بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ پەیداکرد. چونکە مرۆڤ کەوتە ژێر کاریگەری بڕێکی زیاتری بواری کارەبایی ئەو ئامێرانە، دوای ئەوەی ئادەمیزاد بۆ چەندین سەدە هەر لە ژێر هەڕەشەو مەترسی گورگان و بوومەلەرزە و لافاوو ڕەشەباکان بوو، بەڵام ئێستا جۆری هەڕەشەکە گۆڕاوە و مەترسیەکان سەرباری ئەوەی ژمارەیان زیادی کردووە، ئەوە زۆر لە ئێمە نزیک کەوتوونەتەوەو هاتوونەتە ناو ماڵ و تەنانەت ژووری نووستن و خواردن و سەرمێزی دانیشتن و خوێندنی فەرمانگەو قوتابخانەکانمان. کەواتە پێویستە زیاتر هوشیار بین و ڕەچاوی لایەنە تەندروستیەکان و ز یانە چاوەڕوان کراوەکانی ئەو هەموو ئامێرە کارەبایی و ئەلکترۆنیە بین کە ژیانیان ئاڵۆزتر کردووین و ڕۆژانە کارتی سووری چەندین نەخۆشی و گرفتی دەروونیمان بە ڕوودا بەرزدەکەنەوە، کەواتە پێشکەوتن و ئاسانکاریەکانی ئەمڕۆ سەرباری لایەنە خۆش و سوود بەخشەکانی، زیانیشمان پێ دەگەیەنن و ژیانمان دەخەنە مەترسییەوە جا کۆمپیوتەرو

تەلەفزیۆن و جلشۆرو ئامێری کۆپی کردن و فاکس بێت یا مۆبایل و بەکارهێنانە بەر بلاوەکانی، کەواتە خۆپاراستن لە زیانەکانی ئەو ئامێرانە پێویستیەکی گرینگە و نابێ فەرامۆش بکرێ و هیچ جۆرە کەمتەر خەمیەکی تیابکرێ چونکە خوانەخواستە خۆشیەکەمان دەبێتە ناخۆشی و شادیەکەمان دەبێتە خەم و نەخۆشی و ئازار....

# مادده پاککەرەوەکان و کاریگەریان بۆ سەر ژینگە

هەروەك دەبینین بازاڕەکانمان پڕبوونە لە چەندین جۆرە سابوون و شامپۆو ماددەی پاککەرەوەی تر، ئەگەر ناوی گشت ئەو ماددانەش پەیوەست بێ بە پاکوخاوێنی و لابردنی پیسیەکان و هەروەها دوورکەوتنەوە لە نەخۆشیەکان و هۆکارەکانی، بەڵام زۆر جار ئەو ئامانجانە ناپێکن و بەپێچەوانەوە دەبنە مەترسییەك و هەڕەشە لە تەندروستی و ژینگەی مرۆڤ دەکەن. بەتایبەتی دوای تەشەنەکردنی چەندین جۆر لەو سابوون و شامپۆیانە کە تەنانەت شوێنی دروست کردن و ناوی کارگەکانیشیان بەسەرەوە نییەو زۆرجار پابەندی ڕێژە جیهانیەکانی پێکهاتەکەی نابن، بەمەش کاریگەریەکی خراپ لەسەر تەندروستی مرۆڤ بەرپادەکات، بەتایبەتی ئەگەر کۆمپانیا کە زانی کاڵاکەی زۆر دەفرۆشرێ و ڕەواجی هەیە، یاخود لە وەرزی هاویندا کە بێگومان زیاتر خەرج دەکرێ و بەکاردەهێنرێ. چونکە گەرمایە و خەڵك زۆرتر پێویستی بە خۆشووشتن و پاککردنەوەی ناو ماڵ دەبێ و شارەزایان دەڵێن ئەو جۆرە ماددانە دوای بەکار هێنانیان ماددەیەکی کارا دەردەکەن کە بە فۆسفات ناسراوە بەتایبەتی کاتێك کە ئەو ماددەیە لەگەڵ نیتراتدا یەك دەگرێ و دەبێتە خۆراك بۆ بەکتریاکانی ناو ئاو، ئەوانیش گەشە دەکەن و چینێکی سەوزی وەکو قەوزە لەسەر ئەو ئاوانە دروست دەکەن کە سەرچاوەی خواردنەوەو بەکارهێنانی ئێمەن، هەر لەبەرئەوەش زۆر لە وڵاتانی جیهان ئەو ماددانە قەدەغە دەکەن کە فۆسفات چووەتە ناو

پێکهاتەکانیانەوە و زۆربەی ئەو شامپۆیانەی ئێمە ڕاهاتووین بەکاریان بێنین، ماددەی کیمیاوی ترسناکیان تێدایە، چونکە هەروەك زانراوە هەر شتێك بە کەللەی سەریکەوێ دەگاتە ناو مێشك، بۆیە پێویستە بەر لە بەکارهێنانی ماددەکانی ئارایش و بۆیە کردنی قژ لە جۆرو پێکهاتەکەی بپرسین بۆ نموونە ئەگەر ماددە دەرهێنراوەکانی کبریتاتی سۆدیۆم لە پێکهاتەی شامپۆو هەویری ددان پاککردنەوەدا هەبێ ئەوە ئەو ماددەیە ڕاستەوخۆ لەلای مێشکەوە دەمژرێ و کەڵەکە بوونی ئەو ماددانەش لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی کوێربوون و زۆرجاریش ئەو سپرایەی بۆ کوشتنی مێروو بەکاردەهێنرێ، زۆر لە مێرووەکە خۆی زیان بەخشترە، چونکە هەڵمژینی ئەو ماددەیە زیانێکی زۆری هەیەو دەبێتە ئەگەری سەرهەڵدانی چەندین جۆرە شێرپەنجەو ئەگەر مێرووەکان خۆیان بهێننەوە ئەو زیانەیان نابێ هەروەها زۆر لە ئێمە لە کاریگەری ئەو ماددە کیمیاویانە بێ ئاگایە کە لە پاك کردنەوەی گەرماوو ئاودەست و دەستشۆرەکاندا بەکاردەهێنرێت و ئێمەش بەبێ گوێدانە زیانەکانی ئەو ماددانە بۆ پێست و چاو بەکاریان دەهێنین.

خانمی ناو ماڵیش لە هەموان زیاتر ڕووبەڕووی ئەو مەترسیانە دەبێتەوە، چونکە ئەرکی خاوێن کردنەوەی ناوماڵ و ڕاماڵینی پیسایی و زبڵەکان لە ئەستۆ دەگرێ، بۆیە پێویستە شارەزاییەکی تەواوی لەو ماددانە هەبێ کە بەکاریان دەهێنێ و هەموو کونج و کەلەبەرەکانی ناو ماڵی پێ خاوێن دەکاتەوە بەتایبەتی ناو دەستەکان بۆ نموونە چەندین جۆرە دیتۆل هەیە کە هەندێکی لەناو قوتووی جواندان و بەفلچەیەکی تایبەتیەوە بۆ خاوێن کردنەوەی ئەو

شوێنانە لە بازاڕەکان دەفرۆشرێن و میکرۆبەکان لەناودەبات، بەڵام زانایان هۆشداری ئەوە دەدەن کە ئەو جۆرە ماددانە مەترسیەکی گەورەیان بۆ سەر تەندروستی ئێمە هەیە بەتایبەتی ئەوانەی کە ترشی (هایدرۆکلۆریك) یان تێدایە، چونکە دەبێتە هۆی ژەنگ هێنان و سووتانەوەی پێست و چاوو زیان گەیاندن بە جگەرو گورچیلەکان و ئەگەر مرۆڤ بڕێك لەو ماددانەی فووتدا ئەوە دەبێتە هۆی ڕشانەوەو بوورانەوەی، بۆیە دەکرێ لە جیاتی ئەو ماددە کیمیاویە زیان بەخشانە چەند ماددەیەکی تری وەکو بیکاربۆناتی سۆداو سرکەو شەربەتی لیمۆ بۆ پاککردنەوە بەکاربێنین و ئەو ماددانە بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لەسەر ناو دەستەکان بمێنێتەوە و بەفلچەیەکی ڕەق خاوێن بکرێتەوە....

# زۆر بەکارهێنانی مادده پلاستیکیەکان و زیانەکانی بۆ سەر ژینگە

ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا لە کاتی کڕینی جلوبەرگ و خۆراک و پێداویستیەکانی تری ماڵدا ڕۆژنییە چەندین جۆر زەرفی نایلۆن، واتە عەلاگەی نایلۆن بەکارنەهێنین و بەبێ گوێدانە زیانەکانیشی هەر دوای بەکارهێنانیان لوولیان نەدەین و لەگەڵ پاشماوەکانی تر فڕێیان نەدەین، کە بە داخەوە ئێستا بەشی زۆری زبڵ و پاشماوەکانی بەردەرگای ماڵ و فەرمانگەو کۆگاو دوکانەکان پێك دەهێنێ. تەنانەت ئەو جۆرە عەلاگانە، سەر شۆستەو شەقام و کۆڵانەکانیشی تەنیوە وتیایاندا پەرش و بڵاوکراونەتەوە. ئەگەر ئەو دیاردەیە لە وڵاتی ئێمە ئاسایی بێت و هەر تەنها لەسەر شارەوانی بێت. ئەوە لە وڵاتە پێش کەوتووەکان گرفتێکی ژینگەیی گەورەیە، چونکە لە کاتێکدا ئەو جۆرە عەلاگەیە هێمایەکی زەق و زیان بەخشی کۆمەڵگایەکی بەکاربەرە، لە وڵاتێکی پێشکەوتووی وەکو ژاپۆن کە نزیکەی (٣٠) بلیۆن دانەی لێ بەکار دەهێنرێ، حکومەتی ئەو وڵاتە دووچاری کێشەیەکی گەورە بووەو وەزارەتی ژینگە چەند پلانێکی بۆ باج خستنە سەر کڕیارانی ئەو عەلاگانە داناوە، تاوەکو کڕیارەکان ناچار بکرێن بەشێوەیەکی دروست چارەسەری عەلاگە کۆن و دڕاوو بێ کەڵکەکان بکەن و خەمساردانە فڕێیان نەدەن لەکاتێکیشدا کۆی پاشماوەو کەلوپەلی لەکار کەوتووی فڕێدراو لەو وڵاتە ساڵانە خۆی لە زیاتر (٤٦٠) تەن دەدات کە هەر هەمووی

دەسووتێندرێ و گازی دیۆکسینی ژاراوی لێ دەکەوێتەوە.
لێپرسراوانی شاری کیۆتۆ رایان گەیاندووە رێژەی (١٠٪)ی ئەو پاشماوانە لەماددە پلاستیکەکانن و سەرچاوەکەیان بۆ عەلاگەو زەرفە پلاستیکیەکان دەگەڕێتەوە، هەمان ڕێ و شوێنی ئەو باج وەرگرتنەش لەوڵاتی ئەیرلەندا پیادەکراوە کە توانیویەتی پاشماوەی زەرفە پلاستیکیەکان بەڕێژەی (٩٠٪)و لە وڵاتی تایوانیش بەڕێژەی (٦٩٪) کەم ببێتەوە سەرچاوەکان دەڵێن زۆر سووتاندنی ئەو هەموو پاشماوە پلاستیکیە لەوڵاتێکی وەکو ژاپۆن کە بە وڵاتێکی پیشەسازی گەورە لە قەڵەم دەدرێ،دەبێتە سەرپێچی کردنێکی ئاشکرای ڕێککەوتنامەی کیۆتۆی نێودەوڵەتی تایبەت بە کەمکردنەوەی دەرکردنی ئەو گازانەی پلەکانی گەرمای زەوی زیاد دەکەن، چونکە سووتاندنی ئەو هەموو پلاستیکیە ڕێژەی ئەو گازانەی زیاتر دەکاو وڵاتی ژاپۆنیش دەخاتە بەرهێرشی ژینگە پارێزان و بە سەرپێچی کەرێکی زەقی ڕێککەوتنامەکە دادەنرێ، بەو هیوایەی ئێمەش لە کوردستان لەترسناکی و کاریگەریگەریە خراپەکانی ئەو هەموو زەرفە نایلۆنە ڕەنگاوڕەنگە بگەین و هەوڵ بدەین تا زۆر پێویست نەبێ بەکاریان نەهێنین و لەدوای بەکار هێنانیش یەکسەر فرێیان نەدەینە سەر شۆستەو بەر دەرگای ماڵەکان و دەست بە پاك و خاوێنی شارەکان و پیس بوونی ژینگەی وڵاتە شیرینەکەمانەوە بگرین...

# پیسبوونی هەواو کاریگەری بۆ سەر ژینگە

هەوا بە یەکێك لەسەرچاوە سروشتیە گرینگەکان دادەنرێ کە ژیان بەبێ بوونی ئەو مەحاڵ بێ، بۆیە پاراستن و پیس نەکردنی ئەو سەرچاوە زیندووە، لێپرسراویەتی و ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە، چونکە هەوا شتێکی گشتییەو بۆ هەموو کەسێك وەك یەك پێویستەو هیچ سنوورو بەربەستێك ناتوانێ جیای بکاتەوەو رێگای پێ بگرێت. ئەگەر هەر مرۆڤێکی ئاسایی و لەش ساغ رۆژانە (٢-٣) لیتر ئاو بەکاربهێنێ ئەوە لە هەمان کاتدا پێویستی بە (١٥) کیلۆگرام هەوای خاوێن دەبێ و بەرگە هەوای دەوری زەویش لەبارودۆخێکی سروشتیدا بەپێی ئەم رێژانە، لەم گازانەی خوارەوە پێك هاتووە.
نایترۆجین بە رێژەی (٧٨٪) و ئۆکسجین بە رێژەی (٢٠٪) کە ئادەمیزادو گیانلەبەرەکانی تر لە کرداری هەناسە وەرگرتندا پێویستیان پێی دەبێ، ئارگۆن بە رێژەی (٩/٠٪)، گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بە رێژەی (٣٠/٠٪) کە رووەك زۆر پێویستی پێیەتی و ئەگەر ئەمانەش پێکهاتەو بەشە سەرەکیەکانی هەوای دەورو بەرمان بن، ئەوە چەند هۆکارێك دەبنە هۆی پیس کردنی ئەو هەوا پاکەو ژیانمان ناخۆش دەکەن و تەندروستیمان تێك دەدەن و زیان لە گیانلەبەرو رووەك و بەروبوومە کشتوکاڵیەکان دەدەن، ئەوانیش دەکرێنە دوو پۆل، یەکەمیان هۆکارە سەرەکیەکان کە ئەمانەن تەنە خۆ هەڵواسراوەکان کە لە ئاکامی پرۆسەی سووتاندن و پیشەسازیەکان و ئاگربەردانە دارستانەکان و گەردو تۆزە

سروشتیەکاندا بەرپادەبن، گازی دووەم ئۆکسیدی کبریت ($SO_2$) کە لەوێستگە گەرمیەکانی دروست کردنی کارەباو پاڵاوتگەکانی نەوت و فرنەکانی تواندنەوەی ئاسندا دەردەکەون، ئەم گازە بەهۆی پرۆژە ڕەمەکیەکان و نەگرتنە بەری ڕێ و شوێنی تەندروستی و پلانی گونجاو لە وڵاتی ئێمەشدا بە ڕێژەیەکی گەلێك زۆر بە هەوادا دەکرێ و سووتاندنی پاشماوەکانی نەوت و بەکارهێنانە جیاجیاکانی، کەش و هەوای کوردستانیان بەیەکجاری پیس کردووە. سەرباری گازەکانی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن ($CO$) کە لە گزۆزی ئۆتۆمبێلە کۆنەکان و ئەنجامی سووتاندنی ناکامڵی سووتەمەنیە نەوتیەکاندا دەردەچێ. پاشان ئۆکسیدەکانی نایترۆجین ($NOX$) کە لە ئۆتۆمبێل و سەرچاوە نەگۆڕەکانی بەکارهێنانی ئەو گازەوە دەردەچێ وەکو کارگە کیمیاویەکان. هەروەها هایدرۆکاربۆنەکان ($HC$) کە هەموویان لە ئۆتۆمبێلە کۆنەکان و وێستگەکانی سووتەمەنی (بەنزینخانەکاندا) دەردەچێ، بەلام هۆکارە ناوەندیەکانی پیسبوونی هەوا لە مانەی خوارەوە پێك دێ :
گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ( $CO_2$) کە لە پرۆسەکانی سووتاندندا پەیدا دەبێ، کبریتیدی هایدرۆجین ($H2S$) لە پاڵاوتگەکانی پەترۆڵ و پاککردنەوەدا دەردەچێ، سەرباری گازی ئامۆنیا ($NH3$) کە لە پەینە کیمیاویەکان و ئامێرەکانی ساردکردنەوەو سپراکاندا دەردەچێت. دیارە کاریگەرینە ژینگەییەکانی ئەم هۆکارانەی سەرەوە بێجگە لە زیان گەیاندنیان بە تەندروستی مرۆڤ و هەڵمژینی هەوای پیس و ژاراوی و هەناسە تەنگی و دووچاربوونی چەندین نەخۆشی ترسناك، زیان بە ڕووەك و

دارستانەکانیش دەگەیەنێ.
هەمووشمان سووتاندنی کانە کبریتیەکانی دوای ڕووخانی ڕژێممان لە یادە کە چ زیانێکی لە کێڵگە و بەروبوومە کشتوکاڵیەکان دا. سەرباری شێوانی کەش و هەوای وڵات بەگشتی و پیس بوونی سەرچاوە سروشتیەکانی وەکو ڕووبارو کانی و دەریاچەکان.
لە هەمان کاتدا دیمەن و ڕوخساری شارو وڵات ناشیرین دەکات. هەربۆ نموونە ئەگەر بەیانیان لە باشووری پایتەختەوە لە ئاسمانی ئەو شارە بڕوانێ دووکەڵێکی ڕەش دەبینی کە دیمەنی ئەو شارەی بەتەواوی شێواندووەو هەوا پاکەکەی پیس و ژاراوی کردووە، بۆیە پێویستە بە هەموو لایەکمان ئەوەندەی لە تواناداهەبێ، چ وەکو هاووڵاتی یا وەکو دەستەلآت و دامودەزگا حکومیەکان و ڕێکخراوو کۆمەڵەو سەندیکاو دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کارێك بکەین سنوورێك بۆ پیسبوونی هەوای شارەکانمان دابنێین، چیتر ڕێگا نەدەین چەند کوورەیەکی کۆنی کەرپووچ (خشتی سوورکراوە) ئاسۆی شارەکەمان لێڵ بکەن، کارگە کۆن و لە کارکەوتووەکان و ئۆتۆمبێلە مۆدیل کۆنەکان و موەلیدەو ئامێرە پیشەسازیەکان هەوای شارەکەمان دووکەڵاوی بکەن و ژینگەکەمان پیس بکەن. بەو هیوایەی ئێمەش لەمەودوا بە دروست کردنی پشتێنەی سەوزی دەوری شارەکان و زۆرکردنی پارك و باخچەو سەیرانگاکانی ناو شارو شارۆچکەکان و ڕێگە نەدان بە قۆرخ کردنی ئەو پارچە زەویانەی لە نەخشەسازی شارو شارۆچکەکان بۆناوچە سەوزاییەکان تەرخان کراون. لایەك لە مەسەلەی پاك و خاوێن ڕاگرتنی ژینگەی شارو شارۆچکەکان دەکەینەوە و ئەم بابەتە بە هەند هەڵدەگرین و ڕێ و

شوێنی دروست بۆ پاراستنی ئاوو هەوا و سەرچاوە سروشتیەکان دەگرینە بەرو سەرپێچی کاران سزا دەدرێن و بەدائیل بۆ ئەم کارگە کۆن و ئۆتۆمبێلە شڕە دووکەڵاویانە دەدۆزینەوە، لە پێناو وڵاتێکی جوان و ئاوەدان و کەش و هەوایەکی پاك و خاوێندا ...

# زیانەکانی زۆر بەکارهێنانی ئۆتۆمبێل بۆ سەر ژینگەی شارەکان

زۆر لە کۆمەڵە ژینگە پارێزەکان داوایان لە دەوڵەتانی جیهان کردووە تەنها بۆ ماوەی ڕۆژێك دەست لەبەکارهێنانی ئۆتۆمبێلەکانیان هەڵگرن، بەڵکو هەوایەکی پاك هەڵمژین و کەمێك مێشکمان بحەسێتەوە، چونکە زۆربوونی ژمارەی ئۆتۆمبێل لەسەر ئاستی جیهاندا هەرچەندە جووڵانەوەو هاتوچۆی ئاسانکردووە و کاتێکی زۆری گەڕاندۆتەوە، بەڵام کارێکی زۆر خراپی لە تەندروستی مرۆڤ و ژینگەکەی کردووە، چونکە زۆربەی لێکۆڵینەوە تازەکان ئاماژە بەو پیسیەی دووکەڵ کێشی ئۆتۆمبێلەکان و نەخۆشیەکانی دڵ و هەناسەدان دەکەن. سەرباری تێکچوونی هەستی بیستن، کاریگەری زۆربوونی ژمارەی ئۆتۆمبێلیش بۆ سەر ژینگە بەوە زانراوە کەوا ئەو گەرمی و دووکەڵە بەیەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی گەرمی زەوی لە قەڵەم دەدرێ چونکە ماددەیەکی زۆر ورد دەردەکا بەناوی (Particular matter) کە لە کۆمەڵە گەردیلەیەکی وشك و دڵۆپەکی شلدا پێك دێت و ئەو ماددەیە زیانێکی زۆری بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ هەیە، چونکە مرۆڤ دەتوانێ هەڵی مژێ و لەبەر بچووکیش دەچێتە قووڵایی سییەکانەوە، بۆیە ڕاستەوخۆ کار لە ئەرکە سەرەکییەکانی سییەکان دەکات. لێکۆڵینەوە زانستیەکانی ئەم دواییە ڕوونیان کردۆتەوە کەوا زۆربوونی ڕێژەی ئەو ماددە وردانەی ناو هەوا کەتیرەکەی لە (١٠) مایکرۆمەتر کەمترە، دەبێتە

هـۆی بەرزبوونـەوەی ژمـارەی مـردووان و زۆر بـوونی حاڵەتـەکانی دووچار بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ و کۆئەندامی هەناسە، سەرباری تووشبوون بە نەخۆشی ڕەبۆی میللی کە نەخۆشەکە متمانەیەکی زۆردەکاتە سـەرداوو دەرمـان و سـییەکان ئەرکـەکانی خۆیـان بـە تەواوی بەجێ ناگەیەنن و ئاوسانی سییەکان دەبێتە هەمیشەیی و نەخۆشـیەکە لـە کـۆڵ مرۆڤەکـە نابێتـەوە. هـەروەها ئـەو ڕێـژە قورقوشمـەی لـە دووکـەڵ کێـشەکاندا دەردەچـێ کاریگەریـەکی ڕاستەوخۆی لەسەر گەشەکردنی بیرکردنەوەو فێربوونی منداڵ هەیە. دوا توێژینەوەی زانستی دەری خستووە کەوا قورقوشم کاریگەریەکی زۆری بۆ سەر ئەرکە بنەڕەتیەکانی مێشك هەیە، وەکو تەرکیز کردن و زمان و بیرکەوتنەوە و پێشکەوتنی ئەکادیمی لاوان .. سەبارەت بە منـدالآنیش، چـونکە لەشـی منـداڵ هەرئەوەنـد نییـە کـە ماددەکـە هەڵدەمژێ، بەڵکو ئەو ماددەیە بۆماوەیەکی زۆر زیـاتر دەمێنێتـەوە، بۆیە ڕێەی چـوونە نـاو لەشـی منـداڵ (٣٠) جـار لەلەشـی گـەورەکان پترەو مەترسیەکی زیاتر لەسەر تەندروستی زارۆکاندا دروست دەکات جێگـای خۆیـەتی ئێمـەش لـە شـارەکانی کوردسـتان هەڵمـەتێك بـۆ کەمکردنەوەی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان ئەنجام بدەین و ڕێ و شـوێنی دروست بۆکەمکردنەوەی کاریگەریە خراپەکانی ئۆتۆمبێلـە کۆنـەکان پیـادە بکـەین و ڕێگەنـەدەین چـیتر ئۆتۆمبێلـە مۆدیـل کۆنـەکان بەشەقامەکاندا بسووڕێنەوە، سەرباری ئەوەی کە ئۆتۆمبێل لە وڵاتی ئێمـەدا زیـاد لـە پێویـست بـەکار دەهێنـرێ و خـەڵك بـێ مەبەسـت ئۆتۆمبێل لێدەخوڕن. بەکارهێنانەکە بووەتە مۆدیل و چاو لێککەری بەتایبەتی لەناو شارە گەورەکانـدا. ڕێگـەوبان و شـەقامەکانیش بـەو

شێوەیە نین و هاتوچۆ زۆر لەسەرخۆیەو شەقامەکان بەرگەی ئەو هەموو ئۆتۆمبێلە ناگرن، بۆیە جەنجاڵی بە زۆریەی شەقامەکانەوە دیارە و کاریگەری پاشماوەکانی لەسەر هاوولاتیان زیاترە و زۆریەی شەقام و ڕێگاکانیش یا لەناو ماڵانن یا لە نزیك شوێنە نیشتە جێکانن، بۆیە پێویستە خەمێکی زیاتری بۆ بخورێ و هانی خەڵك بدرێ تا زۆر پێویست نەبێ ئۆتۆمبێلی تایبەتی بەکارنەهێنن و ئۆتۆمبێلە گشتیە نەفەر هەڵگرەکان زیاد بکرێت و مۆدیلە تازەکانیان بێنینە کوردستان تا وەکو خەڵك زیاتر هاتوچۆیان پێ بکات بەو ئومێدەی هاوولاتیان لەبەلای ئۆتۆمبیل و زیانە چاوەڕوان کراوەکانی دووربخەینەوەو ژینگەکەمان لە پاشماوەو کاریگەریەکانی زۆربوونی ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان بپارێزین. ....

## پێرست



## نووسەرلەچەند دێڕێکدا

- لـە سـاڵی ١٩٦٤ لـە هەولێرلـە دایك بووە .
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەنــدی و ئامــادەیی لــە هەولێر خوێندووە .
- دەرچووی زانکۆی تەکنەلۆجیای بەغدایە، بەشی ئەندازەی کارەبا، ساڵی ١٩٨٨.
- لـە زۆربـەی گۆڤـارو ڕۆژنامەکانـدا وتـارو لێکۆڵینـەوەی بڵاوکردۆتەوە.
- ئێستا فەرمانبـەرە لـە بەڕێوەبەرایـەتی کارەبـای هـەولێر بەناوونیشانی سەرۆکی ئەندازیاران .
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (مێرگ)ە.
- ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە .
- ئەندامی سەندیکای ئەندازیارانی کوردستانە.